# پەند وەرگرە لە ٥٠ بەسەرهاتی قوربانیانی خۆشەویستی

محمد حەسەن سەرگەینیڵی

چاپی دووەم

هەولێر ٢٠١٣

ناسنامەی

ناوی کتێب: پەند وەرگرە لە (٥٠) بەسەرهاتی قوربانیانی خۆشەویستی

بابەت : ئایینی

ئامادەکار : محمد حەسەن سەرگەڵینێلی

کۆمپیوتەر : نوسینگەی هیوا

چاپی : دووەم/ ٢٠١٣

کتێبخانەی
حاجی قادری کۆیی
دیزاین - چاپکردن - بڵاوکردنەوە
٠٦٦ ٢٢٢٣٨٦٨
٠٦٦ ٢٦٤٨٩٠٧
عێراق - کوردستان - هەولێر



لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی سپاردنی (٥٣١)ی ساڵی (٢٠٠٩)ی پێدراوە.

07504671394
hawler.chap@gmail.com

## (پێشەکی)

### بسم الله الرحمن الرحیم

لە بەشی یەکەمدا کۆمەڵە بەسەرهاتەکی واقیعیی و زیندوومان خستە بەردەم خوێنەرانی کورد، کە پاڵەوانەکانی ئەم فیلمانەی تێدا بوبون بە قوربانیەکانی وەسوەسەکانی شەیتان. لێرەش لە بەشی دووەم دا کۆمەڵە بەسەرهاتەکی تری واقیعیی و زیندوومان خستۆتە بەردەمیان، کە پاڵەوانەکانی تێدا بوونەتە قوربانی خۆشەویستیی و ئەوینی سێکسی. لەوێدا پاڵەوانەکان خۆیان دان بە تاوانەکانیاندا دێنن و تراژیدیاکانیان بە جۆگەلەیەکی نەبڕاوەی فرمێسك دەگێڕنەوە، هەموو ئەوانەش سەرەتا بە ئارەزوویەکی کتو پڕو، وشەیەکی درۆی گورگێکی لە پێستی مەڕدا، یان سەیرکردنەکی حەرامو یان مۆبایلەکی فریودەر تووشی هاتوون. قوربانیەکانیش بەزۆری کچە لاوە ساویلکەکانن، وەکو مەڕی بێ شوان گورگ لێ ی داون.

دیارە شەیتان کاتێ وەسوەسە دەکات زۆر چەکی تایبەتی بەکاردێنێ، لەوانە نەفس هەواو ئارەزوەکانی مرۆڤ . وەکو خودا دەفەرمێ: ﴿إِنَّمَا يَأْمُرُكُمْ بِالسُّوءِ وَالْفَحْشَاءِ﴾ (البقرە/ ١٦٩). واتە: فەرمانتان پێ دەکات بە خراپەو داوێن پیسی یەکان.

﴿وَالْجَآنَّ خَلَقْنَاهُ مِن قَبْلُ مِن نَّارِ السَّمُومِ﴾ (الحجر/ ٢٧).
شەیتان، کە ئەتیرەو لە بڵێسەی ئاگرەو ئیحا بەدەکانی خۆی بەردەوام بۆ سەر دڵی مرۆڤ ڕەوانە دەکات‌و نەستی (اللاشعور)ی وەری دەگرێت. شەیتان وەکو جادووکەرێ جادووەکانی خۆی بەکاردێنێ‌و ئیحاو هالە موگناتیسی یەکانی لەرێگای دەم‌و هزرو دەستەوە بۆ مرۆڤ ڕەوانە دەکات تا لە خشتەی ببات.

﴿أَنِّي مَسَّنِيَ الشَّيْطَانُ بِنُصْبٍ وَعَذَابٍ﴾ (ص / ٤١).
کاتێ جنۆکە دەڕۆنە لەشی مرۆڤەوە ڕاستەوخۆ ڕو لە مێشکی ئەتیر دەکات، کە لەمێشکی ماددی دایەو دەتوانێ بەئیحاو تێفرۆسمانەکانی کار لە هەر ئەندامێ بکات لە لەشدا، توێژینەوە پزیشکی یەکان سەلماندویانە ئەوانەی فێ (الصرع) دەیانگرێ لەرەلەری ئەتیری لە مێشکیاندا هەیە، وەکو (وحید عبدالسلام بالي) لە (وقاية الانسان من الجن و الشيطان/ ل: ٧٣)دا ئاماژەی بۆ کردووە. سەلمێنراوە شەیتانەکان زیاتر دەسەڵات بەسەر مێشك‌و ئەو چەقەی دەسەڵاتی هەیە بەسەر ئەندامانی سێکسدا دەگرێت، وەکو (يوسف الحاج) لە (ضحايا الشيطان)دا (ل: ٢٢٥)دا باسی کردووە. باشترین چارەسەر تەلقینی دەروونی یە بە نوێژو پاڕانەوەو یادی خواو تۆبەکردن، کە ئاسەوارەکانی ئیلقا شەیتانیەکان لە دڵ‌و نەست دا

لادەبات‌و ئیحای خێر جێگایان دەگرێتەوە. چونکە ئیحا گەورەترین کار تێ کەرن لە مرۆڤەکان، ئیحای مرۆڤو ئەجننەکان. ﴿الَّذِي يُوَسْوِسُ فِي صُدُورِ النَّاسِ*مِنَ الْجِنَّةِ وَ النَّاسِ﴾ (الناس/ ٦،٥).

بەڵێ مرۆی شەیتانیش، کە بەتەواوی دڵو نەست‌و هەستی تەسلیم بە ویستی شەیتان کردووەو وەکو رۆبۆنێکی بەرنامەکراو لەژێر ویستی ئەودا هەڵدەسورێ، دەتوانێ وەکو ئەو دەورێکی کاریگەر بگێرێ لە خراپەکاری‌و بلاوکردنەوەی فەسادو بەدرەوشتی دا.

سێکس یەکێکە لەو غەریزانە، کە شەیتان‌و ئادەمیزاد دەتوانن لەرێگایەوە خراپەکاری‌و لادانی سێکسی بلاوبکەنەوەو کەسانی سادەو ساوێلکەی تێدا بکەنە قوربانی ئیحا بەدەکانی خۆیان. چونکە سێکس غەریزەیەکی سەرەکی یە لەلەشماندا‌و لە ریزی خواردن‌و خواردنەوەدایە!.

(د: میلان ریزل) لە (تدریب الادراك الحسي/ ل: ٥٩)دا دەڵێ: (بەدرێژایی ژیانمان دەکەوینە بەر کاریگەری ئیحاو پێ‌گوتنەکان). لە (ل:١٦٤)دا دەڵێ: (ئیحاو پێ‌گوتنەکان دەتوانن کاری بابەتی لە لەش بکەن سەلمێنراوە هاندانی کۆئەندامی دەماری دەتوانێ کار لە تەواوی لەش بکات). وە لە(ل: ٦٥)دا باسی کردووە، کە باشترین چارە بۆ

لابردنی ئیحا بەدەکان نوێژو پاڕانەوەیە لە خوا، کە ئیحای ئیجابین بۆ ئادەمیزاد). لێرەدا دەبینی لەم بەسەرهاتانەدا چۆن مرۆڤی شەیتانی بە وشەی فریودەرو درۆو ئیحای بەد کچانی سادە ڕاو دەکەن‌و نەستیان کۆنترۆڵ دەکەن‌و دەیانکەنە نێچیری بۆ ئارەزووەکانیان‌و داهاتوی دنیاو قیامەتیان لە دەست دەدەن. بێگومان پابەندی بە دین‌و نوێژو پاڕانەوەو ڕۆشنبیری‌و ڕەوشتە جوانەکان باشترین سەنگەرن بۆ قەدەغەکردنی ئەو ئیحا بەدانەو خۆپاراستن لێیان!

**ئامادەکار**

**١٠/١٠/ ٢٠٠٨**

**چیوەی سەروو**

## چیرۆکی (١)

## کچێکی (١٢) ساڵانە هاوار دەکات بە شوم بدەن.

باوك کاتێ گوێی لەکچە (١٢) ساڵانەکەی دەبێ، ڕاشکاوانە بە ڕووی دا دەڵێ: بە شووم بدە وردمە دەیگرێ!! کە دەبێ چی هانی دابێ بۆ ئەو کردارە؟ ئەمە پەردەیەکە ئەکادیمی یە، ئەمە یەکێکە لە قوربانیانی ئەو بەرنامە خراپانەی دەیخرێنە سەر ئەنتەرنێتو سەحنەکانو (ستەرلایتەکان(. ئەم کچەیە لەدوای نوستنی باوانی دا بەدیار ئەو فلمە سێکسی یانەوە دادەنیشێ، کە سەرنجی خەڵکانی نەفس نزم ڕادەکێشێ، هەتا ئەوەندە هۆگریان دەبێ ناچێ بەهیچ لایەکدا نەوەکو هیچ بەشێکی لەو وێنانەی ئەو خراپکارانە لە دەست نەڕوات. ئەمە لەکاتێدایە باوان بێ ئاگان تا ئەوکاتەی کچەکە بە ڕووی باوکی دا هاوار دەکات بە شوم بدە، باوکیش لەو داواکارییە سەری سوڕدەمێنێت. چۆن ئەم قسەیە ناکات، لەکاتێدا ئەو سەیری ئەو گەنجانە دەکات، کە بێ شەرمانە لە بەرامبەر ملیۆنان کەسدا گەمەی سێکسی دەکەن !! ئابڕوو لەکەداربووەو داوێن پاکی لەناوچووەو لەناو ئەو گومڕایی یانەدا بەفیڕۆ چووە. بەڵام کێ تاوانبارە؟ کچەکە، یان باوان، یان ستاڤی ئەو بەرنامانە؟ .....

## چیرۆکی (٢)

## باوکە بڵێ ئامین !

(پیاوێ کچەکەی بە شوو نادات تـا دەگاتـە (٢٧) سـاڵان، ئـەنجا توشی نەخۆشی جەستەیی‌و دەروونی دێ‌و دەیخاتە سەر جێگـا، کاتـێ مردن دەبێتە چارەنوسی، ئەو سـتەمدیدەیە دەڵـێ: کـوا بـاوکم؟ کـە باوکەکە دێ‌و پێی دەڵێت: باوکە بڵێ ئـامین. ئـەویش وتـی: ئـامین. دووبارە وتی: بڵێ: ئامین. وتی: ئامین. وتی: یاخوا خـودا بەهەشـتت لێ حەرام بکات، چۆن منت لەماڵ‌و مێرد حەرام کرد، ئەنجا مرد) .

## چیرۆکی (٣)

## ئافرەتان لە وڵاتی ئێوەدا شاژنن.

دراوسێکەمان بەتەواوی بەساڵدا چووبوو (٧٠) ساڵ زیاتر دەبوو. لەکاتی بینینی دا بەزەییت پێدا دەهاتەوە، دەچوو ژوورو دەهاتە دەرەوە، کەس نەبوو یارمەتی بدات لە خزمو خوێشانی.

خۆی شتی دەکڕی لە خواردنو جلو بەرگ، ماڵەکەی خامۆش بوو، کەس لەدەرگای ماڵەکەی نەدەداو کەس ئاوڕی لێ نەدەدایەوە !

ڕۆژێکیان بە ئەرکێکی ئاینی هەڵسام لەگەڵ دراوسێتی دا، بە بینینی ئەمە ئەم پیرەژنە خۆرئاوایی یە واقی وڕما، کە چی من هیچ کارەکی ئەوەندە بایەخدارم ئەنجام نەدابوو، بەڵام ئەو لە کۆمەڵگایەکدا دەژیا کاری چاکەی تێدا نەمابوو، سۆزو بەزەیی نەدەزانی، پەیوەندی دراوسێتی تەنیا بەیانیت باشو ئێوارەت باش بوو. ڕۆژی دووەم هەندێ شیرنەمەنی بۆ منداڵەکان هێنابوو، پسوولەیەکی هێنابوو، کە لە بۆنەو یادەکاندا پێشکەش دەکرێ، لەسەر پسوولەکە سوپاسو پێ زانینی لە هەمبەر ئەو یارمەتی یە تێدا نوسرابوو، هانم دا بێ سەردانی هاوسەرەکەم بکات. ئەویش ماوە ماوە سەری لێ دەدا، لەکاتی هاتوچۆی دا بۆ ماڵەوەمان زانی

لە وڵاتی ئێمەدا پیاو ئەرکی بەڕێوەبردنی ماڵو منداڵی لەسەرەو کاریان بۆ دەکاتو خواردنو جلو بەرگیان بۆ دەکڕێت، وە لەو ئاستە ڕێزە تێ گەیشت، کە موسڵمانان بۆ ئافرەتی داناوە، وەکو کچو وەکو ژنو وەکو دایك، بەتایبەتی لەکاتی پیربوونی داو منداڵەکانی لە خزمەتو ڕێزی دا پێشبڕکێ دەکەن، هەرکەس دەست بەرداری خزمەتکردن بێ، لە باوانیو لای خەڵکی نەفرین لێ کراوە.

ئەو ژنە لەنزیکەوە دەیبینی خێزان لای موسڵمانان چەند تەبانو ڕێکنو چۆن باوان مامەڵە لەگەڵ منداڵەکانی دا دەکات، چۆن کاتێ دێتەوە ماڵ منداڵەکان وەکو کۆزێ دەوری دەدەنو چۆن ژن لە خزمەتی مێردی دا دەوەستێ، ئەو بەستەزمانە باری ئەوانی لەگەڵ باری خۆیدا بەراورد دەکرد. بیری دەکردەوە ئەو منداڵی هەیەو نەوەی هەیە نازانێ لەکوێنەو کەسیان سەری لێ نادەن، ئەو هەندێ جار خەریکە بمرێو بسووتێ کەس نییە پێی بزانێ، بەلای ئەوانەوە ئەوە هیچ نرخێکی نییە، ماڵەکەشی بەرهەمی ڕەنجی درێژایی تەمەنی خۆیەتی. لای ژنەکەی من باسی ئەو ئاستەنگانەی دەکرد ژنی خۆرئاوا لە ڕاست کاردا دێتە پێشیەوە، دەبێ خۆی پێویستی یەکانی ماڵەوە بکڕێت. پاشان کۆتایی قسەکانی بەوە هێنا: ئافرەتان لە وڵاتی ئێوەدا شاژنن، گەر پیر نەبامە پیاوەکی وڵاتی ئێوەم دەکردە

هاوسەرو وەکو ئێوە دەژیام. ئەم دیاردانە لای هەموو ئەو کەسانە ئاشکرایە، کە لە ولاتی خۆرئاوایە، یان لە بارودۆخی ئەویّ دەکۆڵێتەوە، بەردەوام کەسانیّ لای خۆمان هەیە لەو ژیانەی خۆرئاوا تەریق نابێتەوەو لاسایان دەکاتەوە، ڕۆژنامەو گۆڤارەکان دنیای ئیسلامی یان پڕ کردووە لە سەرنج ڕاکێشان بۆ جلو بەرگو مۆدەی ژنانی خۆرئاواو ئەو ئازادییەی ژنانی خۆرئاوا تیّیدا دەژین: سوپاس بۆ خودا لە ڕاست بەهرەوەرکردنی ئێمەی بە ئیسلام[1].

---

([1]) من دەڵێم خۆزگە تاکی کوردیش وریا دەبۆوە لەو بیّ ئاگایی یەی تیّ یدایەو ئاورێکی لەکلتوری پیرۆزی خۆی دەدایەوە، کە جوانترین ئاینو جوانترین جلو نەریتو ڕەوشتو جوانترین ئادابی کۆمەڵایەتی هەیە، تەنیا بۆ زانست سوودی لەخۆرئاوا وەردەگرت وەکو پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: (اطلبوا العلم ولو بالصين). لەسەر ڕۆشنبیری خۆی دەوڵەتو کیانی خۆی دادەمەزراند. ئەو کاتە لەلوتکەی پێشکەوتندا دەبوو!

## چیرۆکی (٤)

## باوکە تۆ لەناوت بردومو ئێستاش هاتوویت دەگریت :

ئەو کیژە بەستەزمانە پەیوەندی نێوان گەنجو کچی لەڕێگای کەناڵە ئاسمانیەکانەوە ئاشنابوو، کاتێماڵەوە دەنووستن، دەچوو سەیری کەناڵە سێکسی یەکانی دەکرد، کە لە بەشی بەرنامە حەرامەکانو بەدڕەوشتەکانەو لەوێوە غەریزەی سێکسیو هەوەسی دەوروژاند، دوای چەند ڕۆژێ ئارامی نەماو هانی دا، کە دڵدارێك بۆ خۆی بدۆزێتەوەو ئارەزوەکانی دامرکێنێتەوە. کچەکە ویستی بەم ئەزمونە هەڵسێ، ئەوەبو گەنجێکی دۆزییەوە، وەکو گورگی بێ بەزەیی، ئەو کچە بووە پاروویێکی چەور بۆ ئەوو بە ئاسانی قوتی بدات، لەم ڕۆژەشدا نمونەی ئەوانە کەم نییە، ئەو کچە هەژارە چی دەستکەوت؟ ئەو کچە بەرهەمەکەی کۆرپەلەیەك دەبێ، بەدوای ڕوودانی کارەساتەکی جەرگ بڕدا.

ئەو کچە دەکەوێتە دەست پیاوانی پۆلیس، دوای ئەوە بانگی باوکی دەکرێ تا ئەو کارەساتە دڵتەزێنە بەچاوی خۆی ببینێت.

پیاوەکە لەبەردەم کچەکەیدا وەستابوو حەزی دەکرد بەر لەوە مردبایەو ئەو هەڵوێستەی نەبینیبایە .. لەبەردەم پیاوانی پۆلیسدا

کچە هاواری کرد: ڕێگام بدەن بیکوژم! ئەو شەرەفو ناموسی منی بردو لەبەردەم خەڵکی دا ڕووڕەشی کردم!! تۆ هۆکاری ئەوە بوویت ئەو سەتەلایتەت هێنا ماڵەوەو بێ چاودێری بۆ ئێمەت لێ گەڕا، وەکو ئەوەی ئافرەتێکی خراپەکارت هێنا بێتەوەو نەشزانی، تۆ هۆکاری هەموو ئەو بەسەرهاتانە بوویت ئێستاش بۆ داوێن پاکی من دەگریێت ؟!

## چیرۆکی (٥)

## کاسێتی ڤیدیۆ ژیانی منی لەناوبرد :

کچێکی داوێن پاکە لە قۆناغی زانکۆ دایە/ بەشی دەرونزانی، سێ برای هەیە یەکێکیان لە قۆناغی سەرەتایی داو دوانەکەی تر لە قۆناغی ناوەندی دان، باوکیان سەوزە فرۆش بوو خەریکی پەیداکردنی پاروی ژیان بوو.. کچەکەشی زیرەكو داوێن پاك بوو، قوتابیان لەبەر زیرەکی خۆیان تێکەڵاو دەکرد.

لە بەسەرهاتەکەیدا دەڵێ: ڕۆژێکیان لە دەروازەی زانکۆ هاتمە دەر، گەنجێکم بینی زۆر خۆی کەشخە کردبوو، وەکو بمناسێ ئاوا لە من ڕامابوو، بەڵام من گوێم پێ نەدا، دوای ئەوە بەدوای مندا هاتو بە دەنگی نزمو منداڵانە دەیوت: جوانێ، شۆخێ، من حەزم لێیە ببیە هاوسەری ژیانم، ماوەیەکە سەرنجت ڕاکێشاومو ڕەوشتە جوانەکانت ئاگادارم، منیش زۆر بە پەلە دەڕۆیشتم قاچم قاچی دەگرتو ئارەقە لەناو چەوانم دەهات، چونکە قەت هەڵوێستی ئاوام توش نەهاتبوو. بەشێواوی‌و بیر پەرتی چوومە ماڵەوەو سەرقاڵی ئەو بابەتە بووم، شەو لە تۆقینو دڵەڕاوکێدا بووم، خەو نەکەوتە چاوەکانمەوە. ڕۆژی دووەمیش بەم شەنگی یەوە لەبەردەم زانکۆدا وەستابوو بزەی

دەهاتێ، هەمو ڕۆژێ شوێنم دەکەوت، دوایی نامەیەکی کورتی پڕ لە ئەوین‌و سۆزی بۆ ناردم‌و داوای لێ بوردنی دەکرد لەو ئازارانە من. منیش نامەکەم دڕاندو دوای چەند کات ژمێرێ زەنگی مۆبایل هات‌و هەڵم گرت، ئەو گەنجە بە قسەی خۆش دەیوت: نامەکەت خوێندەوە یان نەء ؟ پێم وت: گەر وازدێنی بێنە گەر نابە خێزانم دەڵێم‌و هاوار بۆ تۆ .. دوای کات ژمێرێکی تر مۆبایلی کردەوە، دڵنەوازی دەکردم کە ئەو نیازی پاکەو دەوڵەمەندەو دەیەوێ بمکاتە هاوسەرو کۆشکەکی مۆدێرنی بۆ بنیات دەنێم‌و من بە تەنیا لە خێزانەکەمدا ماوم ... دڵم نەرم‌و دەستم کرد بە قسە کردن لەگەڵی داو هەموو کاتێ چاوەڕێی مۆبایل بووم .. دوای کۆلیژ چاوەڕێی ئەوم دەکرد شایەد بیبینم، بەڵام بێ سوود بوو. ڕۆژێکیان لە کۆلیژ هاتمەدەرو لەبەردەم مندا بوو، لە خۆشیان باڵم گرتن، دەستم کرد بە سواربوون لەگەڵی داو بە ترۆمبیلەکەی‌و هەموو شار دەسوڕاینەوە، هەستم دەکرد تازە دڵی لێ سەندوم‌و ناتوانم وازی لێ بێنم، کاتێ دەیوت: (تۆ داهاتو هاوسەرم دەبی‌و پێکەوە دەژین، تۆ شاژنی منی بڕوام دەکردو لە خۆشیان ئەشکەم دەگرت).

ڕۆژێکیان ئای لەو ڕۆژە ڕەشە، کە چارەنووسی کوشتم‌و ناموسی بردم، ئەو ڕۆژە سواری ترۆمبێلەکە بووم‌و چوومە شوقەیەکی ڕاخراوو

دانیشتین، نەم زانی گەر پیاوو ئافرەتێ پێکەوە دانیشتن سێ یەمیان شەیتانە. بەڵام شەیتان بە قسەکانی ئەو لاوە دڵی داگرتمو سەیری یەکترمان کردو سزای دۆزەخم بۆ بڕایەوە، هەر نەم زانی تازە بوومە نێچیر بە دەستی کوڕەکەوەو شەرەفی شکاندم. وەکو شێتان هەڵسامەوەو وتم: چیت لێم کرد؟ وتی: مەترسە تۆ هاوسەرمی. وتم: هاوسەری چی خۆ مارە نەکراوم. وتی: داهاتو مارەت دەکەم!

بەم شێوەیە چوومە ماڵەوەو قاچەکانم ڕانەدەگرتن، ئاگر لە دڵم بەربوو ... خودایە چیم بەخۆم کرد؟ ئایا شێت بوبوم؟!

زۆر گریامو زۆر خەفەت دایگرتم، تا وازم لە خوێندن هێنا، کەس لە خزمەکانم نەیتوانی قسەم پێ بکات. هیوام تەنیا ئەوەبوو، کە بەڵێنی داوە بێ داخوازیم بکات. ڕۆژ ڕۆژی ڕادەکێشاو وەکو چیا قورس بوون بەسەرمەوە.

دوای ئەو کارەساتە وێرانکەرە دەنگی مۆبایل هات، وەك بڵێی دەنگەکی دوور بانگم دەکات بۆ دیمانە کردن. شادی گرتمی وام زانی ئامادەکردنی کاری هاوسەری یە. دیدارم کردو بەر لە هەموو شتێ وتی: نەکەی بیر لە مێردکردن بکەیەوە، ئێمە بێ مەرج ئاوا پێکەوە دەژین... بە خۆنەویستی زللەیەکم لێ دا تا وای لێ هات تورە ببێ، پێم وت: من وام زانی هەڵەی خۆت ڕاست دەکەیەوە، من وادەبینم

کەسێکی بێ ڕەوشتو بێ نرخیت. لە ترۆمبێل دابەزیمو دەستم بەگریان کرد. ئەنجا بێ شەرمانە کاسێتێکی بەرزکردەوەو وتی: بەم کاسێتە ڤیدیۆیە لەناوت دەبەم. وتم: چی تێدایە، وتی: وەرە با پێکەوە بیبینینو شتەکی چاوەڕوان نەکراوە بۆ تۆ، پێکەوە سەیرمان کرد بینیم وێنەی داوێن پیسی نێوان منو ئەوی بەدزییەوە گرتووە. وتم: ئەی ترسنۆكو بێ غیرەت چیت کردووە ... وتی: بە کامێرای شاراوە ئەمەم گرتووە، کە بەسەرماندا زاڵەو هەموو جوڵەیەکی ئێمە تۆمار دەکات، ئەم کاسێتە چەکێکە بەدەست منەوە لەناوت ببات، بەو مەرجە نەبێ کە ژێرباری ئاماژەکانی من ببیت.

منیش دەگریامو هاوارم دەکرد، چونکە ئەمە هەر کێشەی من نییە، بەڵکو کێشەی خێزانێکە، کاسێتەکەی نەدامە دەستەوە ناچاربوم ببمە دیلی دەستی ئەوو بازرگانی پێوە دەکردمو هەر جارەی دەیدامە دەست پیاوێك، بەم شێوەیە لە قوڕ چەقیمو گۆڕام بە لەش فرۆشێ بێ ئەوەی خانەوادەم پێ بزانێت، چونکە متمانەیان بە من بوو.

کاسێتەکە بڵاوبۆوەو کۆپی یەك کەوتە بەردەستی ئامۆزاکەم، مەسەلەکە تەقییەوە باوکم پێی زانیو هەموو ئەندامانی خێزانی بەسەری ڕاگەیشتنو بێ ئابڕویی ئەم مەسەلەیە لە شاردا دەنگی

دایەوەو ماڵمان بە بێ ئابڕو ناوی دەرکرد، بۆیە لە ترسی گیانی خۆم ڕام کرد، زانیم کە خێزانمان چووە هەندەرانو بێ ئابڕویی یەکەیان لەگەڵ خۆیاندا برد. ئەم کاسێتە بەناو لاواندا بڵاودەبۆوەو منیش لەناو داوێن پیساندا دەژیام. ئەم هیچو نەگریسە بوو منی وەکو بووکە شوشە لەبەردەستی خۆیدا هەڵدەسوڕاندم؟ نەك هەر من بەڵکو زۆر کەسی تری فریو دابوو ماڵی زۆر کەسی تری وێران کردبوو، بۆیە ویستم تۆڵەی لێ بکەمەوە. ڕۆژێکیان سەرخۆش بوو هاتەلامو منیش هەڵم قۆزیەوەو دامە بەر چەقۆو ئەو شەیتانە ئادەمی یەم کوشتو خەڵکیم لە دەست خراپەکانی ڕزگار کرد، ئەوەتا ئێستا لەبەندیخانە تاڵی ئابڕومو پەشیمانیم لەو کارەمو ئەو ژیانەی سنوورم تێدا بەزاندووە دەچێژم .... ئەم بەسەرهاتەم ئامۆژگارییە بۆ کچان، کە نەکەن بە قسەی لوسو نامەی ڕازاوە بە خۆشەویستی فریو بخۆن. خوشکانم واز لە مۆبایل بێنن بۆ ئەم مەسەلانە.

## چیرۆکی (٦)

## یاداشتەکانی پیرەژنێ لەگەڵ خۆشەویستی ناپاکی دا :

فرمێسکی خەمو پەرێشانی لە چاوی ئەو پیرە ژنە هاتە خوار، کە دەڕوانێ بەسەر پەنجەرەکەدا، چاوەکانی داپۆشیوەو خەفەتێکی بەردەوامی لە دڵدا کپ کردووەو ئاهێکی لە ناخدا خەفە کردووە خەریکە هەناوی لەگەڵدا دێتەدەرەوە بوکێکە لە پەنجەرەکەیەوە سەیر دەکات چەندە دڵخۆش بووەو چەندە خەمباری کێشاوە. بە یادەکانی زۆر بۆ دواوە دەگەڕێتەوە. ئەم پیرە ژنە لە سەردەمی لاوی دا زۆر جوانو شۆخ بووە.

ئەو مێردەو خێزانوماڵەکی دەویست وەکو ماڵی خەونەکان بێ لە ڕووی کارگوزاری یەوە، ئەمە ئاواتی ئەو بوو.

سەیری واقیعی تاڵی خۆی کردو لە پەنجەرەکەوە ڕوانی یەوە، فوستانی بوکێنی بینی، وە یادی ئەو ڕۆژانەی دەکردەوە کە کاتی خۆی بە گۆڤارەکان دەبردە سەرو، لەوەی دەکۆڵیەوە کە توشی هاتووەو لە ئاسمانی دەڕوانیو فرمێسکی گوڕو گەرم بەسەر کولمەی دادەبارین. بیری لە ڕابردو دەرکردەوە، کە چی وای لێ کرد توشی ئەو ئازارو ئەشکەنجانە ببێت. بەهار بوو لەگەڵ باوکی دا لەماڵ چووە دەر

بۆ بازێڕو خوشکە چکۆلەکەشی یاوەری بوو، ئەو حەزی نەدەکرد لەگەڵیاندا بچێ، دەنگی تەلەفۆن هاتو زوو خۆی گەیاندێ، دەستە خوشکەکی بوو قسەی لەگەڵدا کردو داوای لێ کرد گەشتەکی کورت بکەنو بە یەکێ لە مەڵبەندە تازەکاندا بسوڕێنەوە. بێ دوودڵی ڕازی بوو. دەستە خوشکەکەی هات پێکەوە ڕۆیشتن، ئاخاوتنیان کردو لێ ی پرسی (بۆی فرێند ـ دۆستت) هەیە؟! وتی: نەء، من چۆن متمانەی خێزانیم لەدەست دەدەم!

دەستە خوشك (الصديقە): ئەمە قسەیەکی کۆنە حەز بە بیستنی ناکەم. لەهیکڕا ئەو دەستە خوشکەی ڕۆیشتو ئاماژەی بۆ یەکێ لە شوێنەکان کردو وتی: ئێرە دەستە گەنجێکی لایە، بڕۆ هەلەکە لەدەست مەدە، من بە تەواوی ڕەفزم دایە، بەڵام دوای سوربونی ئەو هاوڕێیەم قایل بومو دوای چەند خولێ ئاشنابم لەگەڵیاندا.

ئەوەبوو هاوڕێکەم تەسلیم دەبێ پسولەیەك هەڵدەگرێتەوە، کە ژمارەی مۆبایلەکەی تێدایە، ئەو گورگێك بوو لە گورگەکانو ئەویش خۆشحاڵی خۆی دەربڕیو بە دۆستی ڕابردوی گۆڕییەوە.

گەشتەکە دوایی هاتو کچەکان بۆ ماڵ گەڕانەوە.

کچەکە ویژدانی ئازاری دەدا. لەوکاتەدا پەیوەندییەکی پێ گەیشت، کە لە هەمان دەستە خوشکە بەد شانسەکەیەوە. پەیوەندییەکە ئاوابوو :

کچەکە : چۆنی؟ هاورێیەکە: ئایا هێشتا پەیوەندیت بە دۆستەکەتەوە نەکردووە؟ کچەکە : ناتوانم ! دوای ئەوەی ئەو هاورێیە شومە زۆری لێ کرد قایلی کردو پەیوەندی پێوەکرد.

پەیوەندی یەکەم کورت بوو، دووەم زۆرتر بوو، سێ یەم جار ژوانو دیداری تێدا هاتەدی. کچەکە چووە ژوانو بەرێزو شەرەفو ناموسەوە رۆیی .. کاتێ لە ژوان گەڕایەوە بێ ئابروویی بەدوای خۆی ڕادەکێشا، چی بکاتو چی بە خزمو کەسانی بلێت، بە دایكوباوکی؟ چەند مانگو ڕۆژ ڕابردن، بینیم سکم زیندووەو دەجولێ .. ئەی خودایە ئەمە ئاکامی زینایەکەیە. لە ماڵ ڕایکرد نەوەك ئابڕوی بچێت. دوای تەواوبونی ڕۆژانو مانگەکانی دوگیانیەکەی کامڵ بوو کاتی منداڵ بونی هات. چووە لای مامانێکی ناودار تا لە ماڵ منداڵەکەی ببێت. ئەنجا ڕادەکاتو منداڵەکە بەجێ دێلێت. ئەو هاورێیەی بیر کردەوە کە بەد شانسی کرد. پەیوەندی بە خۆشەویستەکەیەوە کرد شایەدبێ قوتاری بکات. ئەویش بە گاڵتەوە پێ ئەکەنی، چونکە ئەوە

یەکەم کەس نییە منداڵی زینای لێ پاشەکەوت بکات. تەلەفۆنەکەی بە ڕویدا داخست. چی بکات پەنای بردە بەر سواڵو دەرۆزە کردن.

لەکاتی شوێن بزربونی دا باوکی لە ونبونی ئەو ئاگادار کرایەوە، دۆزرایەوەو دوایی خرایە مەڵبەندی چاك کردن (الاصلاحیة) . دوای سی ساڵ هاتەدەر. وەکو بەرگ درو دەستی بە کار کردو ئەو ساڵانە هەر بەوەوە خەریك بوو، چونکە خێزانی لە خۆی دوور دەخەنەوە.

فرمێسك بەدوای فرمێسك لەچاوی ئەو پیرەژنە دەهاتنە خوارو یادی کراسی بوکێنی دەکردو یادی ئەو ڕۆژەی دەکرد دۆستە درۆزنە فریودەرەکەی بەڵێنی تێدا پێ دابوو. دنیای لێ سوڕاو دەنگی بوکیو شینی ئامێزانی یەکتری بوون. دوای هاوارێ بە زەوی داکەوتو دەیوت: خوایە ڕوحمم پێ بکەیت. دوای ماوەیەك دراوسێیە پیرەکەمان مرد. بەخاك سپێرا بێ ئەوەی کەس بۆی بگری. لەژیانی هاوسەری خۆش بێ بەش بوو، لە کوڕو نەوەکانو سەیر کردنو نواندنی سۆز لەگەڵیاندا بێ بەش بوو. تا لە وشەی دایکە، کە گەورەترین وشەیە بێ بەش بوو. هەموو ئەوەش لەبەر یەك ژوانو دیدار. خوای بەندەکان لەگەڵی دا بە بەزەیی بە، چونکە دنیای لەدەست چوو با پەسلانی لەدەست نەڕوات !

# چیرۆکی (٧)
## شەیتان چوارەم کەسمان بوو

(أبو عبدالله) دەڵێ: نازانم چۆن ئەم سەربوردەیەت بۆ بگێڕمەوە، کە ماوەیەکە لەگەڵی دا ژیاوم‌و، تەواوی ڕێڕەوی ژیانمی گۆڕی، من نەمدەویست باسی بکەم، تەنیا لەبەرئەوە نەبێ، کە هەست بە بەرپرسیاری دەکەم لەلای خودای گەورەوە تا ئەو گەنجانەی سەرپێچی خوا دەکەن‌و ئەو کچانەی بەناوی خۆشەویستی قلّپەوە وێڵ دەبن وریا بکەمەوە.

ئێمە سێ هاوڕێ بوین، یان واچاکترە بڵێین شەیتان چوارەممان بوو، گەوجی‌و بەخۆنازین کۆی کردبووینەوە.

دەچووین کچانی ساویلکەمان بە قسەی شیرین ڕاو دەکردو دەمانبردن بۆ کێڵگە دوورەکان، لەوێ ئێمەیان وەکو گورگێك دەبینی، کە دوای مردنی ویژدانمان پاڕانەوەیان نەرمی ناکات. بەم ڕەنگە شەوو ڕۆژانمان لە کێڵگەکان‌و چادرەکان‌و ترومبیلەکاندا بوو لە کەناری دەریاکاندا، تا ئەو ڕۆژە هاتە پێشەوە، کە قەت لەیادم ناچێتەوە.

وەکو جاران چووینە کێڵگەو هەموو شتێ ئامادەبوو، نێچیرەکە کچێك بوو بۆ هەر یەکێکمان، شەراب و مەی نەفرین لێ کراومان پێ بوو، ئەوەی لەیادمان چوو بوو خواردن بو، پاش ماوەیێ هاوڕێیەکمان بە ترومبیلەکەی چو خواردن بکڕێت، کات (٦)ی ئێوارە دەبوو، چەند کات ژمێرەکی برد نەگەڕایەوە، کات ژمێر (١٠) زۆر نیگەران بوم و ناچاربووم بڕۆم سۆراغی بکەم، بە ترومبیلەکەم ڕۆیشتم و لەڕێگادا ڕوداوەکی ترسناکم بینی، کاتێ چوومە سەری بینیم ترومبیلی برادەرەکەمەو ئاگری لێ بەرز دەبێتەوەو بەلایەکدا وەرگەڕاوە. بە پەلە وەکو شێتان ڕام کرد لەو ترومبیلە کە ئاگری تێ بەربووە دەری بێنم، کاتێ بینیم نیوەی لەشی بووە بە خەڵوز واقم وڕما، بەڵام هێشتا گیانی تێدا مابوو، هێنامە سەر زەوی، دوای خولەکێ چاوەکانی کردنەوەو وڕێنەی دەکردو هاواری دەکرد: ئاگر ... ئاگر ..

بڕیارم دا بە پەلە بیگەیێنمە نەخۆشخانە، بەڵام بە دەنگەکی گرینەوە وتی: بێ سودە، ناگەمە ئەوێ.

فرمێسك بینی گرتبوم و هاوڕێکەم دەبینی لەبەردەم مندا دەمرد، هاواری کرد لەهیکرا: چی پێ بڵێم، چی پێ بڵێم، بە سەرسوڕمانەوە لێم پرسی؟ کێت مەبەستە، بە دەنگەکی قوڵ وەکو لە بیرەکی قوڵەوە بێ وتی: (خودا).

هەستم کرد ترس گشت لەش‌و گیانی داگرتم، لەهیکرا هاوڕێیەکەم هاواری کرد، کە دوا هەناسەی بوو .. ڕۆژان ڕۆیشتن بەڵام وێنەی ئەو برادەرە مردووەم لەبەرچاو بزر نەدەبوو هەمیشە بە هزرمدا دەنگی دەزرینگایەوە، کە هاواری دەکرد چی بڵێم، چی بە خوای گەورە بێژم ؟.

لەخۆم دەپرسی: من چی پێ بڵێم‌و چاوم پڕ لە فرمێسك‌و ئەشك بوون‌و هەڵ دەلەرزیم بە سەیری. هاوکات گوێم لە دەنگی بانگدەر بوو بۆ نوێژی بەیانی بانگی داو فەرموی: (الله أكبر .... الله أكبر) .

کاتێ بانگی کرد (حي على الصلاة = وەرە بۆ نوێژکردن) هەستم کرد بەتایبەتی بانگی من دەکات بەرەو ڕێنومایی‌و ڕوناکی.

خۆم جوان شوشت‌و لەشم پاکژ کردەوە لەو تاوانەی چەند ساڵ نقومی بوبوم. نوێژم دەکردو لەوکاتەوە سوپاس بۆ خوا وازم لێ نەهێناوەو بووم بە مرۆڤەکی تر، سوپاس بۆ ئەو خوایەی هەموو باران دەگۆڕێت. بڕیارم داوە خوا تەمەن بدات عومرە بکەم، بەویستی خودا حەجیش بکەم، تەمەن بەدەستی خودایە. ئەمە بەسەرهاتی تۆبەی منە،لێرە بەهەموو لاوێ دەڵێم:نەکەن هاوڕێیەتی ئەو برادەرانە بکەن، کە یاسایە قەدەغە کراوەکانتان پێ دەشکێنن. بەسەرهاتی من پەندی زۆر تێدایە،ئایا کەسێ هەیە وانەی لێ وەربگرێت؟

# چیرۆکی (٨)

## کۆڵیتی خەمان (کوخ الاحزان).

هاوڕێیەك نوسیویەتی: برادەرێکم هەبوو لەبەر ڕەوشتو چاکەکانی خۆشم دەویست، دیمەنەکەی دڵی خۆش دەکردمو قسەکانیو ئامادەبونی کامەرانی دەکردم. زۆری لەگەڵدا ژیامو هیچ کارێکمان لە یەکتری نەدی گلەییو گازاندەیی تێدابێ، تا سەفەرم کردو بەجێم هێشت، ماوەیێ نامەمان بۆ یەکتری دەنارد، پاشان پەیوەندیمان بە یەکترەوە پچڕا.

پاش ماوەیێ گەشتەکەم تەواوکردو گەڕامەوە، خەمی گەورەم ئەوەبوو بۆ ساتەکیش بێ چاوم پێی بکەوێت، چونکە پەیوەندیمان پێکەوە زۆر خۆش بوو، لەهەموو ئەو شوێنانەی لێم بینی بوو گەڕام نەم دۆزییەوە. چومە ماڵە دراوسێکەی وتی: لەمێژە باری کردووە. لەنێوان ترسو ئومێد دابووم وام زانی تازە چاوم پێ ناکەوێتەوە. شەوێکیان گەڕامەوە ماڵەوە، بەهۆی تاریکی شەوەکە ڕێگام بزر کردو شوێنەکی چۆلەوانیم هاتە پێش، وام دەزانی شوێنی جنۆکەکان بێ، چونکە وا زانرابوو کەسی لێ نەبێت. وام دەزانی لە دەریایەکدامو شەپۆلەکانی دەم بەنو دەم هێنن. هەر کە هاتمە ناوەڕاستی شەقامەوە گوێم لە هاوارێ بوو لە ماڵێکی ئەو گەڕەکەیەدا، دیسان دەنگەکی

تر هات، ئەم ناڵەیە کاری تێ کردم، وتم: بەڕاستی ئەم شەو زۆر ڕازو نیازی هەڵگرتووە، پەیمانم بەخوا دابوو هەمیشە یارمەتی لێ قەوماوان بدەم ...

بۆ ئەومالە ڕێگام گرتە بەرو بەهێواشی لە دەرگاکەم دا، پاشان بەتوندی لێم دا، کچەکی گچکە هاتەدەرو چاك لێم ڕوانی، بینیم چرایەکی بەدەستەوەبوو جلو بەرگەکی دڕاوو شڕی کردبۆ بەر! وتم: کەستان نەخۆشە؟ ئەنجا هەناسەیەکی پڕ لە زوخاوی هەڵمژیو هەر ئەوەندەبوو دڵی لەگەڵدا نەهاتەدەرو وتی: بەڵێ فریام کەوە باوکم لەسەرە مەرگدایە!! دەمرێت. کچەکە کەوتە پێشمو چوینە ژورەکی دەرگا بچکۆلەو چومە ژورو وام زانی چومە ناو گۆڕێکەوە. دەچمە لای مردوێ نەك نەخۆشێك. لێ ی نزیك کەوتمەوەو چومە تەنیشتی یەوە، وەکو قەفەزێکی ئێسقان بوو کە هەناسەیەکی کزی دەدا ...

دەستم لەسەر ناوچەوانی داناو چاو پڕ لە ئەسرینی کردەوەو بەینەکی سەیری کردم، پاشان لێوەکانی کردنەوەو بە دەنگەکی نزم وتی: (ئەحمەد)! سوپاس بۆ خوا کە ساغیو لە کۆتایی دا ئەی هاوڕێ تۆم دۆزییەوە. هەستم کرد دڵم خەریکە بتەقێو زانیم ئەو ونبووەم دۆزییەوە کە سۆراغم دەکرد. ئەی خوایە ئەم ڕێکەوتە چی بوو! ئەمە ڕۆژانو چارەنوسەکانە، ئەمە ئەو هاوڕێیەم بوو بەشوێنی دادەگەڕامو

تازە دەستم لیّ ی شوشتبوو، ئەمە هاوڕیّی جارانم بوو، بەڵام لەبەر نەخۆش بوونی نەم دەناسی یەوە. بە هاوڕیّکەم ووت، بەسەرهاتی خۆت باس بکە بۆ گەیشتویە ئیّرە؟ وتی: با بەسەرهاتی خۆمت بۆ بگیّڕمەوەو ویژدانی خۆم بحەسیّنمەوە، ئەنجا گیّڕایەوە :

چەند ساڵێ لەمەوبەر خۆمو دایکم لە ماڵێکدا دەژیاینو دەوڵەمەندێکیش دراوسێمان بوو، لەناو کۆشکەکەی دا کچەکی زۆر شۆخو نازدار هەبوو، ئەوەندە دڵم بۆی بزوت ئارامم لەگەڵی دا نەما، هەر سۆراغی ئەوم دەکرد تا خستمی یە داویەوە.

دڵی ئەویش وەکو دڵی منی لیّ هاتبوو، لە ساتەکی بیّ ئاگادا لەخودا دوای ئەوەی بەڵیّنی خواستنی ئەوم دابوو ... ئەویش تەسلیم بە خواستی من بوو گیانی دایە دەستی منەوە، لیّت ناشارمەوە ڕۆژێکیان شەرەفم لیّ سەند، زۆری نەبرد دوای چەند هەفتەیەك زانیم دوو گیان بووە. هەوڵم دا لیّ ی دوور بکەومەوە پەیوەندی لەگەڵ بپچڕیّنم. ئەو کچە لەو ماڵەدا نەما کە یەکترمان لەناوی دا دەبینیو هەواڵو باسی ئەوم نەما. ئەو مەسەلەیەی ئەوم هیچ گویّ پیّ نەدا. دوای چەند ساڵیّ پۆستە نامەیەکی ئەو کچەی بۆ من نارد : (ئەگەر بۆم هەبایە نامەت بۆ بنوسم تا پەیمانەکی ڕابردو یان خۆشەویستی یەکی کۆن نویّ بکەمەوە، یەك دیّرو یەك پیتم نەدەنوسی، چونکە من

پێم وانی یە پەیمانەکی وەکو پەیمانی تۆی ناپاکی کەرو سۆزەکی وەکو سۆزی درۆیینەی تۆ شایانی ئەوەبێ یادی بکەمەوەو پێی دڵخۆش بم، یان داخی بۆ هەڵبکێشم‌و داوای نوێ بونەوەی بکەم. خۆت چاك دەزانی کاتێ منت بەجێ هێشت لەمیان هەردو لامدا ئاگرەکی هەڵگیرساو هەبوو، منداڵێ دەجولا، ئەمەش بۆ ئاخ هەڵکێشانە بۆ ڕابردوو هەم بۆ ئایندە، بەلاّم تۆ گوێت بەمە نەداو، لەبەر من ڕات کرد، تا خۆت نەکەیە بەرپرسیار لە ڕاست ئەو خراپەیەی تۆ ئەنجامت داو فرمێسکە ڕژاوەکان کە تۆ داتباراندن نەیانسڕییەوە، ئایا دوای ئەوە دەتوانم تۆ بە پیاوەکی شەریف‌و بە شەڕەف دابنێم؟ نەخێر ناتوانم هەتا بە مرۆڤیش وەسفت بکەم، چونکە ئەوەی تۆ کردت سیفەتێکی گیانداره دڕندەکان بوو هەمو ئەو سیفەتانەت لەدڵی خۆتدا کۆکردنەوەو لە یەك ڕواڵەتدا نواندنت.

درۆت لەگەڵدا کردم گەر گوتت خۆشم دەوێی، بەلاّم تۆ تەنیا خۆت خۆش ویست، هەموو مەسەلەکە ئەوەبوو منت کردە ڕێگایەك بۆ ڕازی کردنی خۆت، هەر بۆیەش بەلای مندا ڕەت بووی، گەر نا لە دەرگای منت نەدەداو ڕوت لە من نەدەکرد.

کاتێ وتت دەتخوازم پەیمانت شکاند، وات زانی ژنێکی داوێن پیس دەخوازیت، ئەم تاوانەش تەنیا وێنەی تۆیەو بەرهەمی دەستی تۆیە،

گەر تۆ نەبایە نەدەبومە داوێن پیس‌و تاوانبار. زۆر هەوڵم بۆ تۆدا تا ماندو بوم‌و وەکو کۆرپەیەك کە دەکەوێتە بەردەستی ستەمکارێ ئاوا کەوتمە بەردەستی تۆوە، داوێن پاکیت لە من دزی، بوومە ئافرەتێکی نەفس نزم‌و خەمبار، کە ژیان بەلامەوە دژواربێ‌و مردنم بەلاوە ئاسان بێ، چ چێژێ بۆ ئافرەتێ هەیە لەژیاندا گەر نەتوانێ ژیانی هاوسەری پێکەوە بنێ‌و ببێتە دایك. بەڵکو لەناو ئەو کۆمەڵگایەدا بە سەرشۆڕی دەژی‌و هەڵدەلەرزێ‌و هەناوەکانی لە ترسی گاڵتە پێ کەران دەتاوێتەوە.

پشودانت لێ هەڵگرتم، چونکە دوای ئەو کارەساتەو ڕاکردنە لەو کۆشکە گەورەیەو ئەو بەهرە فراوانەیەو گوزەرانە خۆشەدا بۆ شوێنێ کە کەس نەمناسێ‌و سەری خۆ هەڵگرتنم لەوێوە، زۆر بە پەرۆش‌و نیگەران بووم.

تۆ باوانی منت کوشتن، تەنیا بەهۆی خەم هەڵگرتنیان لەسەر ون بوونی من‌و نەدیتنەوەی من مردن، تۆ منت کوشت، چونکە ئەو ژیانە تاڵەی لە کاسەی تۆم خواردەوەو ئەو خەمەی بەهۆی تۆ نۆشیم لە لەش‌و ناخمدا بەشێوەیەکێ ڕۆچوون وەکو مێشی سوتاوی هەڵزوراو بەسەر جێگای مردندا خستوومی.

لەماڵەوە ڕام کرد، چونکە توانای بەرەنگار بونەوەی ماڵو باوانم نەبوو. چوومە شوێنەکی چۆلەوانیو وەکو سەرشۆڕێ ژیام، تۆبەم کردووەو داواکارم خودا تۆبەی قبوڵ کردبمو نزای گیرا کردبم، تا لە خانەی مردنو شەقاوەتەوە بمبا بۆ خانەی ژیانو خۆشگوزەرانی.

ئەوەتا من دەمرم، وە تۆ ئەی درۆزنی فریودەرو دزی بکوژ، بڕوا ناکەم تا خوا تۆڵەی منت لێ نەکاتەوە دەست بەردارت ببێت ..!

بەخوا من بۆیە نامەم بۆ نەنوسیویت تا پەیمانت لەگەڵدا نوێ بکەمەوە، یان داوای سۆزو بەزەییت لێ بکەم، تۆ زۆر لەوە لەلای من هیچ تری. من ئێستا لەسەر لێواری گۆڕمو لە هەڵوێستێ دام، کە ماڵ ئاوایی لەخۆشیو ناخۆشیەکانی ژیان دەکەم، هیوای ئەوەم نەماوە دەستەملانی ببمەوەو کاتی ژیانمان نەماوە تێی دا، بۆیە ئەم نامەیەم بۆ نوسیویت تا ئەو ڕاسپاردەیەت بدەمەوە دەست، کە کچەکەتە، گەر چی ئەم کارەساتەی ڕابردو بەزەیی تێدا ڕاپازنیویتو نەیهێشتووە، بەڵام بەزەیی باوکایەتی لەگەڵدا بنوێنە. ئاگاداری بەو با وەکو دایکی سەرگەردانو کلۆڵ نەبێت (خوات لەگەڵ).

بەڵێ ئەو مردو کچەکەی لەو چۆلەوانیە بەجێهێشتو کەس لە خوا نەبێ نەبو بیحەوێنێتەوە. هەروەها ئەم بەسەرهات گێڕەرەوەیە دەڵێ: (هەر کە ئەم نامەیەم خوێندەوە سەیرم کرد فرمێسك بەسەر

پێڵوی دا لێژ دەبونەوە، پاشان ئەو هاورێیە لەسەر جێگا کەوتووەم وتی: (بەخوا من هێشتا نامەکەم تەواو نەکردبو، کە لەشم کەوتەوە لەرزین‌و خەریك بوو دڵم بتەقێ، بۆیە چومە ئەو ماڵەی منی تێدا بینیبو، کە ئەم کەلاوەیەیەو لەو ژورەدا بینیم‌و لەسەر جێگایەدا مرد. ئەو منداڵەی لەبەردەمتە (١٠) ساڵانەبو بەسەر دایکی یەوە دەگریا. ئەو تاوانەی من لە ژیانمدا وەکو درِندەیەك خۆی نواند، کە چرِنۆکان دەهاوێ‌و کەڵبەکانی جیرِ دەکاتەوە. هەر کە وریابونە تۆبەم کرد لەگەڵ خوادا پەیمانم دا ئەم ژورە بەجێ ناهێڵم، کە ناوم ناوە ژوری خەمەکان تاوەکو ئەو ئافرەتە قوربانی یە بژیم‌و وەکو ئەو بمرم، ئەوەتا ئێستا ئیمرۆ دەمرم لە مردنی خۆم رِازیم. تۆبەم کردووەو متمانەم بەخوایە، کە ئەو بەڵێنەی پێی داوم ئەنجامی دەدا، شایەد ئەو ئازارو ئەشکەنجانەی کێشاومە ببێتە بارمتەو کەفارەتی گوناهەکەم. ئەم کچەی منیش رِاسپاردەیە بە ملی تۆوەیە بە پاکژی‌و پەروەردەی جوان رِای بێنەو هیچ لەبارەی باوانیەوە پێ مەڵێ.

## چیرۆکی (٩)

## ئەو جوانەی ژیانی منی وێرانکرد :

داستانێکی پڕ لە ژانە خاوەنەکەی خۆی دەیگێڕێتەوەو دەڵێ:

لە ڕۆژەکی ڕەش دا لە یەکێ لە بازاڕەکانی بازرگانی دا لە قاوەخانەیەکدا دانیشتبوم قاوەم دەخواردەوەو ڕۆژنامەم دەخوێندەوە، لە هیکرا، کچەکی چاوجوانی دڵگیر لە لەش‌و لاردا بە لەنجەولار بە لامدا ڕەت بوو وەکو شێتان‌و تینوێك سەیری جوانی‌و ڕێکی منی دەکرد، منیش خۆنەویستانە بڵندبوم‌و شوێنی کەوتم، چووە ناو یەکێ لە دوکانەکانەوە منیش لەبەر خاوەن دوکنەکە نەك لە بەرخودا نەم توانی، بەدوای ئەودا بڕۆمە ژورەوە، ئەویش بە ڕوی جوانی ڕوی تێ کردم‌و بە دەستە سپی‌و جوان‌و نەرم‌و پڕ لە زێڕو ئەنگوستیلەو ئەڵماسەکانی ئاماژەی بۆ کردم کە شوێنی بکەوم، بێ ئاگایانە چوینە ناو شوێنەکەوە، بە هەموو ئەدەبێکەوە پێی وتم: با ژمارەی مۆبایلەکەت بزانم، منیش بەدەم بۆم خوێندەوەو ئەویش لەناو مۆبایلەکەی دا خەزنی کرد، کە لەم چاخەدا زۆر کارەساتی بەسەرداهێناین، چونکە نەمان زانی بۆ چاکە بەکاری بێنین. دوای چەند کات ژمێرێ واتە لە ئاخری شەودا مۆبایلی بۆم کردو دەستی

بە گوفتاری شیرین کردو هەردوکمان قسەی جوانمان کردن، ئەو وتی: من تەلاقدراوم‌و (٣١) ساڵەم، بەڵام گەر دەت بینی وات دەزانی (١٨) ساڵەیە، وە ئەو خاوەن پیشەیەو زۆر دەوڵەمەندە.

دوایی دەستمان کرد بە دیاری کردنی دیمانە وەکو سەرەتایەك لە چێشتخانەکاندان پاشان لە قاوەخانەکاندا، لە هەموو دیمانەیەکیشدا هیچم لێ دەست نەدەکەوت، هەتا ماچێکیش، یان دەستم لە دەستی بدەم. زیاتر دڵم گرتی‌و وام زانی شەریفەو پاکیزەیەکەسی بەر لە من نەناسیوەو جگە لە منیش کەسی تری ناوێ، چونکە من جوانم، ڕاستە من تاڕادەیەکی زۆر شەنگ‌و جوان بووم. ڕۆژێکیان مۆبایلی لەگەڵدا کردم‌و وتی بۆ کارەکی گرنگ کارم پێتە، وتم ژیانم لە خزمەتتدام. وتی: دەمەوێ لە فلان چێشتخانەدا چاوم پێت بکەوێت‌و دوای کات ژمێرەکی تر لەوێ ببە. وتم: بەسەر دۆزەخدا ئامادە دەبم. لە چێشتخانەکەدا ئامادەبوم‌و پێم وت: ها ژیانم چیت لێم گەرەکە بیکەم؟ لەو کاتەدا سەفەرنامەی پلە یەکی لە جانتاکەی دەرهێنا بۆ (قاهیرە)و بەناوی منەوە بوو، کە (٣) ڕۆژان لە ئوتێلی (سەمیر ئەمیس)ی پێنج ئەستێرەدا بمێنمەوە. دیسان شیکەکی (١٠٠٠٠) ڕیالی دامێ‌و پێی وتم: دەمەوێ هەر سبەی بچیە قاهیرە وەکو لە سەفەرنامە (پاساپۆرت)ەکەدا هاتووە بۆ ئەو ئوتێلە (دۆزەخیە) بچی

بۆ لای فلان کەسە بەناوی (......)و ئەمەش ژمارە تەلەفۆنەکەیەتی؟! تا بتباتە فیسار کۆمپانیایە لەجیاتی من برێ جلو بەرگی مۆدەی جیهانی لە (پاریس)ەوە بکڕیو ئەمە وەرەقەی بریکاری یە لەلای منەوەو تۆ بەم کارە هەڵسەو ڕێکەوتنەکە ئیمزا بکە، تکایە دوا مەکەوەو بڕۆ. وتم: بەسەرچاو ژیانەکەم.

دوای هەرایەك ئیجازەم لەسەر سەرۆك کۆمپانیاکە وەرگرتو لە هەمان ژواندا سەفەرم کرد، خۆزگە ئەم گەشتەم نەکردبایە. دوای ئەوەی کات ژمێر (٤) گەیشتمە ئەوێ هەندێ پشوم دا، لەکات ژمێر (٦)ی ئێوارەدا مۆبایلەکەم تاودایە ئەو ژمارەیەم لێ دا (خۆزگە لێم نەدابایە). دەزانن کێ لەسەر ئەو هێڵەیە؟ ئەوە یارەکەمە بەر لە من گەیشتۆتە ئەوێ! بەسەر سوڕمانەوە وتم: فلانەیت؟ وتی: کتو مت، ئایا شتەکی کتوپڕە بۆ تۆ خۆشەویستەکەم؟

وتم: بەڵێ. وتی: من بۆیە هاتوم زیاتر ئەم کارەت بۆ ڕون بکەمەوە. پاشان وتی: خۆشەویستەکەم وەرە بەشی ژمارە(؟!). منیش بەگورجیو کامەرانی یەوە چومە ئەو بەشەی ئوتێلەکەو، بینیم جلەکی تەنکی ڕوتی پۆشیوە، کە هەرکەسێ بەو مۆدەوە بینیبای خۆی بۆ ڕانەدەگیرا.

منی لە باوەش گرتو ماچمی کردمو خۆم لەیاد کردو لەگەڵی دا جوت بومو زینام کرد (پەنا بەخوای گەورە). ئاوا خۆش ڕام بواردو ئیجازەکەم بۆ (١٠) ڕۆژ درێژکردەوەو هەموو ئەو ماوەیە لەوێ مامەوە، دوای ئەوە بە یەك فرۆکەی مۆدێرن گەڕاینەوە لە تەك یەك دانیشتبووین. ئێمە لە هەوا بوونی، بەڵام لەسەرەوە دەیبینین، بەڵام پەنا بەخوا ئێمە هەستمان بە بونی خوا نەدەکرد. تا ساڵێ ئاوا پەیوەندیمان بەردەوام بوو! من بۆ زینا دەچومە کۆشکی ئەوو ئەویش دەهاتە شوققە خراپەکەی من، کە شایان بە ئەو نەبوو، بەڵام لەبەر جوانی منو ڕابواردنی سێکسی خۆی دەهات! ڕۆژێکیان منو براکەم لە شارێکدا بووین، چارەنوسی خوا وابوو ڕوداوەکی هاتوچۆ قەوما، برایەکەم توشی خوێن پژانەکی توند بوو، بەڵام خۆم سوپاس بۆ خوا ئازارم پێ نەگەیشت، هەندێ ڕوشانم توش هات، بەڵام ئازاریان نەبوو. خەڵکی پڕژانە سەرمانو مانگی سور هاتو بە پەلە بۆ نەخۆشخانەیەکی نزیکی ڕوداوەکەی ڕاگواستینو، گورج براکەمیان بردە ژوری نەشتەرگەری، نوژدار داوای لێم کرد، خوێنی پێ ببەخشم، چونکە خوێنەکەمان یەك گروپ بوو، وتم: من ئامادەم. بردمیان بۆ ژوری خوێن بەخشین، دوای ئەوەی نمونەیەکیان لێم وەرگرتو لە ڕاست نەخۆشیە درمەکان پشکنینیان لەسەر کرد، من متمانەم بەخۆم

هەبوو، قەت ئەو خەیاڵەم لە دڵی نەدەگەڕا کە ڕۆژێ لە ڕۆژان لەگەڵ ئەم دۆستەم کاری سێکسیم کردووە. سەرەنجامی پشکنینەکە دەرکەوت‌و پزیشکەکە بەڕویەکی خەمبار هات‌و وتم: ها براکەم چی بەسەرهاتووەو هاوارم کرد ئایا مردووە؟ وتی: نەء . وتم: ئەی چی بووە؟ وتی: خوێنت توشی نەخۆشی پیسی (ئایدز) بووە ...

ئەو قسەیە وەکو تریشقەیەك بوو، کە لە ئاسمانەوە داباریێتە سەرم، خۆزگەم دەخواست بەر لەوکاتە زەوی شەق بوایەو هەڵی لوشیبام، بۆیە ڕاست کەوتم بەسەر زەوی دا لە هۆش خۆم چوم، کاتێ لەو بورانەوەیە بێداربومەوە لەشم لەترسان هەڵدەلەرزی،. دەم پرسی: دەبێ من توشی ئایدزی کوشندە هاتبم، ئەی خودایە دەبێ لە کەیەوە من توشی ئەو بارودۆخە بێزراوە هاتبم؟ پزیشك پێی وتم: تۆ توش نەهاتوویت، بەڵام تا دەمری ئەو ڤایرۆسەت هەڵگرتووە، خواش یاریدەدەرە!!

دوای دو ڕۆژ لە ڕودانەکە براکەم مرد خوا لێ ی خۆش بێت، من بەو ڕوداوە زۆر خەمبار بوم، ئەو هەر برام نەبوو، بەڵکو زۆریش ئامۆژگاری دەکردم لەم کچەی دۆستم دور بکەومەوە، چونکە ڕابردو بەسەرهاتی ئەوم بۆ گێڕابۆوە .. دوای (١٠) ڕۆژ لە مردنی ئەو، ئەم کچە مۆبایلی بۆم کرد: ها ئازیزەکەم لەکوێی؟ لەمێژە دیار نیت؟

منیش بەتوڕەییەوە پێم وت: چیت دەوێ؟ وتی: چیت بەسەردا هاتووە؟ وتم: برام مردووە بەڕوداوێو تازیە بارم. وتی: تەمەنی درێژی بۆ زیندوان بەجێ هێشت بێت، بەڵام لەبەر دڵڕەقی یان نەیگوت: خوا لێ ی خۆش ببێت. پاشان وتی: بەهەر حاڵ کەی دەتبینمو ڕێزی هەستی منی نەگرت؟ وتم: دوای ئیمڕۆ چاوم لێ نادەیەوە.

وتی: بۆچی؟ وتم: بەڕاستی من خۆشم دەوێی نامەوێ زیانت لێ بدەم. وتی: چیت بووە؟ وتم: نەخۆشی ئایدزم هەڵگرتووە!

وتی: چۆنت زانیوە؟ وتم: لەکاتی ڕوداوی منو براکەم دا (ر) ئەوەم زانی ... پاشان ڕوداوەکەم بە تەواوی بۆ گێڕایەوە. وتی: باشە داوێن پیسیت لەگەڵ ئافرەتی تردا کردووە؟ وتم: نەء . وتی: خوێنی کەست تێ کراوە؟ وتم: نەء . وتی: کەواتە ئاواتم هاتەدی. بەتوڕەییەوە وتم: ها فلانە مەبەستت چی یە؟ وتی: دەمەوێ تۆڵە لەهەموو قوڵەغێ بکەمەوە، چونکە ئەوان منیان توشی ئەم نەخۆشیە کردووە، تۆش یەکێکی لەوانەو کەسانی تری وەکو تۆش لەڕێگادان! پاشان تفم بەڕودا کردو مۆبایلەکەی داخست.

وتم: (**حسبنا الله ونعم الوكيل**) لەدەست تۆ ئەی کچی ئایدزو زۆر قسەی ترم کردن، کە نامەوێ بیانلێمو لەدڵتان بدەم. من ئێستا (٣٢) ساڵمو ژنم نەهێناوەو لە تەمەنی (٢٩) ساڵی دا دوچاری هاتم.

لەو ساتەوە من تا ئیمرۆ خوشكو براكانمو دایكم داوای ژن هێنانم لێ دەكەن، بەڵام من ڕەتی دەكەمەوە، چونكە ئایدزم هەڵگرتووەو ئەوان بێ ئاگان. من نامەوێ ئەم نەخۆشییە توشی هاوسەری ژیانمی بكەمو بۆ منداڵەكانیشمی بگوازمەوە، بۆ زانین من برا گەورەم، باوكم بەڕەحمەت بێ كە (٢٩) ساڵەبوم زۆر سوربوو لە سەرم ژن بێنم، بەڵام ئاواتی نەهاتەدیو مرد، تا برادەرانم لەسەر كار هەمیشە لەڕوم دەدەن بۆ ژن ناهێنی؟ من ئێستا دەرونم زۆر ماندووە كێشم لە (٦٨) كیلۆوە بۆ (٥٥) كیلۆ دابەزیوە. هەموو ئەوەش بۆ شەكەتی دەرونیو ئەو كابوسە بێزاركەرەی لەو نەخۆشیە پیسەوە دوچارم بووە، كە نازانم كە دەمكوژێت، من تۆبەم كردووەو نوێژ دەكەمو قورئان دەخوێنمو دەرخی دەكەم، هەرچەندە كاتەكەی بەسەرچووە بۆیە من نامە بۆ براو خوشكانی موسڵمانم دەنوسم لە كاری ناڕەوا دور بكەونەوە كە خوا توڕە دەكات، وەكو داوێن پیسیو تاوانی ترو پەند لە من وەربگرن.

# چیرۆکی (١٠)

## قوربانییەکەو قازی :

ئەو گەنجێك بو لە پێڕی بەرەڵاییو ڕابواردن بوو، ئەیزانی هاوسێی کچێکی جوانو دەوڵەمەندو خۆشگوزەرانە، هەر بە یەکەم سیلەی چاو دڵی پێوە نوساو، پاشان دوبارە کردنەوەی ئەو سیلانە زیاتر دڵی ڕاکێشا، ئەنجا نامە گۆڕینەوە هات، پاشان سەردانی یەکتری کردن، پاشان لە یەکتری دابڕان. بەسەرهاتی ئەو دوانە هەموو ئەو بەسەرهاتە خۆشەویستی یانە کۆتا پێ دێنێ کە کوڕانی ئادەمو حەوا لەسەر زەوی پێکی دێنن. کاتێ کچەکە گەڕایەوە خەمێك دڵی داگرتبوو کۆرپەلەیەك لە هەناوی دا دەجولا، هەندێ جار سەرەتا ڕێگایەك هەیە بۆ شاردنەوەی ئەوە، پاشان نهێنی یەکەو قسەکە بلاو دەبێتەوە، گەر سنگیش بۆ ئەوە فراوان بێ سکی بۆ فراوان نابێ، گەر ئیمڕۆش بیپارێزێ سبەی ناتوانێ بیپارێزێت.

کاتێ خەمەکە خەوی لێ هەڵگرتو شوێنی کەلەکانی ناخۆش کرد، هیچ ڕێگا چارەیەکی نەدۆزییەوە خۆی لێوە دەرباز بکات. بۆیە پەنای بردە بەر شاردنەوەی ئەم رازەبەلام بێگومان هەر ئاشکرا دەبێت. ئەو شوێنەی لێی بوو ژورەکی چۆل بوو لە کەلاوەیەکەوە

خەڵکی کەم لێ بوو، جگە لە خەمەکانی کەسێ هاودەمو هاوڕازی نەبوو.

ڕۆژگار ڕۆیشتو کەس نەیتوانی ڕایبگرێ، ئەنجا چی ڕویدا؟ هەرچی ئەم گورگە بو کۆمەڵگا لێ ی خۆش بوو تۆبەکەی قبوڵ کردو تاوانەکەی لەیاد کرد، ئەو وەکو دادوەرێ لە دادگای شەرعی دادەنرێت، هەرچی ئەو کچە قوڕ بەسەرە بوو منداڵەکەی لەو ژورە بە فەتارەت دەرەدا بوو، هەرچی هەیبوو فرۆشتی، تا ئەو شتانەی بەخۆشیەوە دەکرد، تاجلو بەرگو ناو ماڵیشی فرۆشت و هیچی نەما، خۆیو منداڵەکەی بەبازاڕدا دەگەڕان شەوێکیان پیاوێ چووە لای ئەویش زانی بۆ داوێن پسی هاتووە، بەلام بەگوێی نەکرد، ئەم پیاوە لەکاتێدا، کەزانی ژنەکە پارەی لێ دزیوە،بۆ لای دادگا سکالای کرد.

ڕۆژی لێك جیاکردنەوەی حەقو ناحەق هات. بەرەو دادگا بانگ کراو دەستی کچەکەی گرتبوو، کە حەوت ساڵانە دەبوو قازی سەیری مەسەلەکەی کردو بڕیاری دادگایی خۆی دەدات. کاتێ ڕۆڵی کچەکە هاتو چاوی پێ کەوت واقی وڕماو خەریك بو هزری کاس بکات. چونکە ئەو قازییەی ناسی یەوە، کە گورگو ئەو لاوەبوو ئەو بەلایەی بەسەردا هێنا.

بە تەماشاکردنێکی سوك لێ ی ڕوانیو پاشان هاواری کرد، کە لەو شوێنەدا دەنگی دایەوەو وتی: ئەی دادوەر دور بکەوە، تۆ بۆت نییە دادوەری دۆزی من ببیت. چونکە منو تۆ هەردوکمان دزینو هەردوکمان ناپاکینو، ناپاکیش دادگایی ناپاك ناکاتو دز دادگایی دزان ناکات. قازیو ئامادەبوان لەو قسە سەیرانە سەریان سوڕما، ویستی پۆلیس بانگ بکاتو بیکاتە دەرەوە، ئەویش دەمامکی لەسەر ڕوی لادا، کاتێ قازی بینی بەتەواوی ئەوی ناسیەوە. کچەکە دەستی کرد بە تەواوکردنی قسەکانیو وتی: من دزیاری ماڵم، بەڵام تۆ ناموس دزیو، ناموسیش لە ماڵ لەپێشترەو تاوانی تۆ لە تاوانی من گەورەترە، ئەو کەسەی ماڵی دەدزرێ دەتوانێ پەیدای بکاتەوە، یان قەرەبووی بکاتەوە، بەڵام ئەو ئافرەتەی کە ناموسی دزراوە ناتوانرێ بدرێتەوە، چونکە ناموس ڕۆیشتووەو ناگەڕێتەوە، گەر تۆ نەبوایت نە دەدزراو سەری بەو حاڵە نەدەگەیشت. مادام وایە کورسی یەکەت بۆ کەسێکی تر چۆل بکە، لە تەك منەوە بوەستە تا دادگا بە یەك تاوان دادگاییمان بکات، کە تۆ سازت داوە منیش ڕام بووم تێیدا.

کاتێ من بینیم هاتیە ئەم جێگایە دەرگەوان بۆ هاتنی تۆ هاواری کرد، خەڵکان لەبەر تۆ هەڵدەستێ! کاتێ هاتمەوە ژورو خۆم بینی

پیاوەکان هەنگاویان بۆ لای من هەڵدێناو دڵەکان هەڵیان دەکوتایە سەرم، لە دڵی خۆمدا وتم: بەخوا سەیرە، زۆر ناوونیشان هەیە درۆ دەکەنو زۆر نازناو هەیە فریودەرن. تۆ منت هێناوەتە ئێرە تا حوکم بدەی بە زیندانی کردن، وەکو ڕابردو هیچت نەکردبێ دەرحەق بە منەوە، تا ویستت شتەکی تریش بخەیە سەر ئەم مەسەلەیەی ڕابردو،... ئایا کەسێ نییە شینو زاری بۆ بەدبەختیو کارەساتی من بکات؟ گەر هیچ ئاماژەیەك نەبێ بۆ لای تۆی ڕابکێشم ئەوە کچەکەتە، کە هەمیشە ئەم پەیوەندییەی نێوان منو تۆ تێك نادات.

لێرەدا ئەم گورگە ئەم قازییە سەری بەرز کردووەو سەیری کچەکەی خۆی کردو ڕایگەیاند ئەم ژنە شێت بووەو پێویستە ڕەوانەی نوژدار بکرێ، خەڵکەکەش بڕوای کرد. وە بڕیاری لێ بوردنی بۆ دا، خەڵکەکەش بڕوای کرد. ئەنجا قازی هەڵسا.

ئەی خودایە!

عوى الذئب فاستأنست بالذئب   اذ عوى وصوت انسان فكدت اطير

# چیرۆکی (١١)

## سەتەلایت (الدش) ژیانی منی وێران کرد :

سەرەتا من کاری ئازادم دەکرد، لە سایەی خوا بازرگانیەکەم سوودی هەبوو خێرەکی زۆری بۆم هەبوو، ژیانم لەسەر رێگای راستی ئیسلام بوو. قەت رۆژێ نەبوو لە پێنج نوێژەکان داببڕێم، بەتایبەتی نوێژی بەیانی، کاتێ دەمبینی وتارەکی ئاینی هەیە لەخۆشیان خەنی دەبوم، گەر لە شارەکی تریش بایە بۆ بینینی دەچومو حەزم دەکرد لە ریزی یەکەمی دا دانیشتبام، زۆر بەوە شانسم هەبوو، کە ژنەکی چاكو گوێڕایەڵم هەبوو پێنج نوێژەکانی دەکردنو چاك مشوری ماڵی دەخواردم. خوا چەند کورو کچێکی لێ دابومێ، کە ئەوانە بون: (عادل، خالید، سوعاد، ئەمەل).

خێزانم ئەو بلێسەو شۆقە بوو رێگای رِوناك دەکردمو ئەو دڵخۆش کەرەبوو دڵی شاد دەکردم، رۆژانو ساڵانو مانگان چونو منداڵەکانم گەورە بوونو پێیان نایە زانکۆوە، چاوەرێی ئەو رۆژەم دەکرد منداڵەکانی خۆم ببینم بڕوانامەی زانسی یان هەڵگرتبێ، بەڵام رۆژگار لەسەریەك سێرە نامێنێتەوە، بێ گەردی بۆ ئەو خوایە گۆڕان پەیدا دەکاتو خۆی ناگۆڕێت. دوای ئەوەی بە هێمنی یەوە لەگەڵ خێزانی خۆمدا ژیامو، بەختەوەرو کامەران بووم، تا برادەران ئێرەییان

بە من دەبرد، ئەنجا ئەو ڕۆژە هات ژیانی من بۆ ژیانی لەناوچونو کلۆڵیو کەساسیو زیندانیو بەرەڵای کۆڵانو ئاوارەو دوور لە خەڵکی بگۆڕێت .. ئەنجا ئەم داستانە چییە ژیانی منی کوشتو خێزانی منی پەرتەوازەو ئاوارە کرد ؟!

ڕۆژێکیان عادلی کوڕم، کە کوڕی گەورەم بوو هاتە ماڵمانو ئامێری سەتەلایتی پێ بوو، منیش لەو کارە دزێوە زۆر واقم وڕما، بەچاوێکی قێزەونەوە لێم ڕوانی، وتم: دەتەوێ چی بکەیت؟ وتی: دەمەوێ سەتەلایت دابمەزرێنم تا کەناڵو قەناتە ئاسمانییەکان ببینین، کە لە جیهانەوە پەخش دەکرێن، تا لە جیهانەکی دابڕاودا نەژێین. وە بەدواکەوتوییو کۆنەپەرستیو دوور لە دنیای شارستانی ژیان بەسەر نەبەین. باوکە دەمانەوێ لە چەرخێکی ڕوناکیو شارستانیو تەکنەلۆژیو سەدەی بیستەمو مانگی دەستکردو ژیانی ڕەهاو پێشکەوتودا بژین.

ئەم قسانەی عادلی کوڕم بەلامەوە سەیر بوون، چونکە کوڕێکی هێورو بەڕێز بوو، منیش وەکو شێر بە پەلە لێ ی چومە پێشو وتم: کوڕم ئەو کەناڵە ئاسمانیانە دەرگایەکن بۆ پڕوپاگەندەی خراپەکاریو داوێن پیسی، هەرچەندە مرۆڤ هەوڵ بدات پەیوەست بێ بە بەرنامە بەسودەکانی شەیتان هەر فریوی دەدات دەست بۆ قەناتەکانی تری

ببات. نمونەی ئەمەش ئەم پەندەیەی پێشینانە (ژەهرە کراوەتە ناو هەنگوینەوە). کوڕەکەم، زۆر سوربوو لەسەر قسەکانی وتی: گەر سەتەلایت لەم ماڵەدا دانەنرێ دەڕۆم قەت نایەمەوە ئەم ماڵە.

لێرەدا دایك لەترسی سەرهەڵگرتنی کوڕەکەی سکاڵای کردە بەرمو لێم پاڕایەوەو بەسوتاوییەوە دەگریا، دیسان منداڵەکانی تریشم شان بە شانی دایکیان دەستیان بە پاڕانەوە کردتا ڕێگایان بدەم، خوای گەورە ڕاستی فەرمووە:

﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِنَّ مِنْ أَزْوَاجِكُمْ وَأَوْلَادِكُمْ عَدُوًّا لَّكُمْ فَاحْذَرُوهُمْ﴾. (التغابن/ ١٤). بۆ ئەم مەسەلەیە ڕاوێژم بە دۆستانو هاوڕێیانم کرد. هەندێ لەوانە وتیان ئامان نەکەی بە قسەی منداڵەکانت بکەیت، چونکە ئەم کەناڵانە شەڕو زیانێکن بەناوی پێشکەوتن دەمامك دراون، ئەو فیلمە سێکسی یانەی ناموسو ئابڕویان تێدا نییە ئامێرێکن بۆ لەناوبردنی منداڵەکانمان. هەندێ هاوڕێی تر وتیان پێویستە قایل ببی، چونکە منداڵەکانت لەو حاڵەتەدا لەژێر چاودێری تۆدا دەبنو دەتوانی چاودێرییان بکەیت، دیسانەوە دەتوانی گوێ لە هەواڵی عەرەبیو جیهانیو بەرنامەی ئاینیو زانستی بگریت.

من قسەکانی ئەوانەم پێ خۆش بوو ئەو سەتەلایتە نەفرین لێ کراوەم هێنا ناو ماڵمەوە. بەم شێوەیە ئەم میوانە قورسەم هێنایە ماڵمەوە، بەڵام قەت سەیرم نەدەکرد، ڕۆژان و مانگان ڕۆیشتن ئاوەڕم لێ نەدایەوە.

بەڵام منداڵەکانم بونە مودمین و شەیدای قەناتە ئاسمانیەکان لە فیلمەکان و زنجیرە دراماکان و پیشانگای جوانکاریەکان و پیشانگای شا جوانەکان و وێنە سفورەکان لەژێر ناوی ڕۆشنبیری سێکسی دا، بەڵام شەیتان گوریسەکەی درێژەو ئارامی نابڕێتەوە، سەربای ئەوەش سوربونی ئەو لەسەر گومڕا کردنی ئادەمیزادەکان مەبەستی سەرەکی یەتی. ئەو هانی منی دا وردە وردە گومڕام بکات، هات وەسوەسەی بۆ کردم کە دانانی سەتەلایت شتەکی باشە، پاشان هانمی دا گوێ لە هەواڵەکانی بگرم، دیسان لە هەواڵە زانستی یەکانی بڕوانم، پاشان پەیتا پەیتا بە شەرمەوە لەو قەناتە ئاسمانیانەم دەڕوانی، دوای ئەوە بە تەواوی ئالودەی بوم.

دوای ئەوەی ئەو قەناتانە چونە دڵمەوە پێم لەسەر بینینی فیلمە ڕوتەکان داگرت، کە لارو لەنجەی سێکسی دەکەن و پڕن لە فریودان و وتەی پڕ لە قسەی پوچ و سوك. من و منداڵەکانم بە چەند سەعات لەبەردەم ئەو قەناتانە دادەنیشتین کە کچانی شۆخ و شەنگ پیشان

دەدەن، تا وام لێ هات لە نوێژکردنەکان سستی بکەمو لەکاتی خۆیاندا نەیانکەمو وردە وردە تەرکە مزگەوت بووم، تا بە تەواوی دورکەوتمەوە.

ئەو فەرمودەیەم لەیاد کردبوو،کە ئەو کەسەی دڵی بە مزگەوتەوە دەنیشێ یەکێکە لەو حەوت کەسانەی خودا لەدوارۆژدا سێبەریان لێ دەکات: (رجل قلبه معلق بالمساجد).

وام لێ هات نوێژم دەکرد بەڵام دڵم هەر لای بینینی فیلمە خۆشەویستی یە سێکسی یەکان بوو. بە تەواوی لەو قەناتە ئاسمانیانەدا قوڵ بوبومەوە.

خۆمو منداڵەکانمو هاوسەرم شەوو رۆژ سەیری وێنە حەرامەکانمان دەکردن بێ باك لەخودای گەورە. ئاکامی هەموو ئەو شتانە لاوازی بڕوای لێ کەوتەوەو هۆگریمان بە فیلمو شانۆیە عەرەبیو ئەوروپی یەکان شوێنی ئەوەی گرتەوە، لەگەڵ دیمەنەکانی دا پێ دەکەنینو دەگریاین. دڵم بووە شەیدای شای هونەرەکانو جوانیەکان (مارلین مۆنرۆ)و (ئەلیزابێس تایلور)و (مادونا)و جوانە فریودەرەکانی تر.

ئەنجا وردە وردە شەیتان فریودانەکانی پتر بوون، تا زەبرەکی کوشندەو پشت شکێنی لەخۆمو خێزانەکەم دا. (کە لەچیرۆکی: ١٢ ـ ١٣ـ ١٤ـ ١٥ دا دەیبینیت).

# چیرۆکی (١٢)

## عادلی کورم :

عادلی کورم ژنەکەی بە بەردەوامی دەکوژێو ژیانی لێ دەکات بە دۆزەخ، قەت بە خەیاڵمدا نەدەهات ڕۆژێ بێ منداڵەکانم لابدەنو لەخشتە بچنو وێران بن. (عادل) کوڕە گەورەکەم نامەی لەگەڵ کچێکی ئەوروپی دا دەگۆڕییەوە بەهۆی (رسیفر دیجیتاڵ)ەوە، تا ڕۆژێکیان هەواڵمان بۆ هات کە زەماوەندی لەگەڵدا کردووە. نەك هەر ئەوەندە بەڵکو ئەو ژنە گاڵتە جارەی هێنایە ماڵیشمان، کوڕەکەم زۆری خۆش دەویست، کە چی هاوشانی ئەو نەبوو لەگەڵ ئەوەشدا ماڵو زێڕی بە پێش وەر کردبوو، لەگەڵ ئەوەشدا من ڕازیم نەبوو، وە لەگەڵ ئێمەی موسڵمانیشدا گونجاو نییە، کە پەیوەستن بە ناموسو شەرەفەوە، بەڵام ئەوان گوێ بەمە نادەن. ڕوداوی (مونیکا ـ لویسکی) لە ماڵی ئێمە دور نەبوو ... زۆری نەبرد ئەو ژنە داڕناوە لە ڕەوشت ماڵی ئێمەی پڕ لە داوێن پیسی کرد، وەکو وتراوە خوی شیری هەتا پیری.

ڕۆژێکیان عادلی کورم بینی گەنجێ لەپاڵ ژنەکەیدایە، ئەویش ڕێك دەست بۆ دەمانچە دەبات ژنە دۆستەکەی دەکوژێ، لە ئاکامدا

کوڕەکەم ڕاپێچی زیندان کرا، بەڵکو داهاتوو چاوەڕێی سێدارە دەکات، بەم ڕەنگە کوڕە گەورەکەم لەدەست دا.

منیش بوومە هۆی ئەوەی لە دەستی بدەم، چونکە ڕێگام دا (رسیفر دیجیتاڵ) بێنێتە ماڵمان.

ئەو ناپاکی لەگەڵ ژنەکەیدا کردو ئەویش ناپاکی لەگەڵدا کرد.

ئەمە ڕاستە وتراوە: هەر کەسێ زینا بکات ڕۆژێ دێ زینای لەگەڵدا بکرێتەوە.

# چیرۆکی (١٣)

## خالیدی کوڕم :

خالیدی کوڕیشم لەدوای شیشەکانی بەندیخانە بوو، ئەو قوتابی یەك بوو لە قۆناغی زانکۆدا بوو، بەهۆی هۆگربونی بە تەماشاکردنی کەناڵە ئاسمانیەکانو شەونخونی کردن بۆیان چەند جاریێ دەرنەچوو، ئەنجا توشی مودمینی مادده هۆشبەرەکان بوو، دەچوو پارەی لە دایکی دەدزی تا بووە دزەکی ڕەسمی، شاندەکی دزی دانابون بۆ بڕینی ماڵانو دوکانەکانو دزینی پارەو زێڕەکان، تا پێویستی یەکانی خۆی پێ سەد بکات لە مادده هۆشبەرەکان بەتایبەتی تریاكو دەرزی هۆشبەرەکان. لەسەر ئەو بەرنامە مایەوە تا کەوتە دەستی پیاوانی ئاسایشەوەو (١٢) ساڵ حوکمی زیندانی کردنی درا.

## چیرۆکی (١٤)

## سوعادی کچم :

سوعادی کچم بەهۆی زۆر دەرنەچون لە خوێندندا سەرنەکەوتو سەوداسەری ژیانی ئەوروپا بوبو لە جلو بەرگو گوێ گرتن لە گۆرانیو مۆسیقای تیژو قەناتی ئاسمانی.

ئاشنایەتی لەگەڵ لاوێکی کەم ڕەوشتدا پەیدا کردبوو ئەویشی بەرەو ئەو خراپکاری یە ڕاکێشابوو، لە ئاکامدا منداڵەکی بیژی لێ پاشەکەوت بوو، کاتێ بەمە زانرا ڕایکردو کچەکەش هەر ڕای کردو ئابڕوی خۆی برد، تا ئێستا هەواڵی نازانم.

# چیرۆکی (١٥)

## ئەمەلی کچم :

هەرچی ئەمەلی کچم بوو، کچە گچکۆلانەم بوو، حەزی لە گەنجەکی بێ دین دەکرد، کە بڕوای وابوو دین تریاکی گەلانەو مودمینی مادده سەرخۆشکەرەکانیش بوو. ئەوەبوو مێردی پێ کرد. کچەکەشم خوی مێردی گرتو ئەویش بو بە شەراب خۆر. رۆژێکیان مێردەکەی داوای شتێ لە ژنەکەی دەکاتو ئەویش وەلامی ناداتەوە چونکە دەخواتەوە، مێردەکە بەردەوام هاواری شتە دەکات، تا تورە دەبێو شوشەی شەرابەکەی دەدا بەسەری داو لە هۆشی دەباتو، ئێستا لە نەخۆشخانەی دەرونی یەو توشی شێتیو بورانەوەی توند هاتووە.

هەرچی ژنە کەساسەکەم بوو بەرگەی ئەو هەموو گرفتانەی نەگرتو توشی گرفتی دڵی (الازمة القلبية) هات. چونکە هەموو منداڵەکانی یەك لە یەك لە دەست بونەوە، ئەنجا ئەو یارمەتی منداڵەکانی داو ئەو سەتەلایتە بێتە ماڵمانو فشاری خستە سەرم. ئێستا لە بارەکی هستیری دا دەژیم، ئایا سەرزەنشتی خۆم بکەم یان شەیتان، یان خێزان. ئێستا نازانم چۆن لەگەڵ ئازاری ویژداندا بژیم. داواکارم لە خوا دەروم لێ بکاتەوەو لە تاوانەکانم خۆش بێت.

## چیرۆکی (١٦)

## سەتەلایتی شوم (الدش المشؤم) :

ڕۆژێکیان ئەو پیاوە لێم وەژور کەوت، کە شێوەکەی لام نامۆ نەبوو، چاك دەمناسیو لەچاو تروکاندنێك دا بە زاکیرەو یارمدا ڕەت بوو. کە هاتە ژور حەپەسابوو، وەك بڵێی هەموو خەمی دنیای داوە بە کۆڵدا، لەبەر دەرگا وەستاو کەسایەتی بەڕێزی بە من ناساند، ئەو هاوڕێیەکی لەمێژینەی من بوو ڕۆژگار لە یەکتری دابڕاندبووین. بەخێرهاتنم کرد، وامزانی دوای ئەو دابڕانە درێژە بۆ سەردانی من هاتووە، ویستم ڕێزی بگرم، بەڵام وادیار بوو بە پەلە بوو، لەبەردەم مندا دانیشتو ئاهو داخی لە سنگی دەهاتنە دەر، وەکو کێوێك خەم بون، پاشان داوای کرد ڕێگای پێ بدەم بەسەرهاتەکەی بۆم بگێڕێتەوەو، وتی:

هاوڕێ هەمیشە قسەم لە زانایان وەردەگرت، کە هەڕەشەی لە خراپکاری دەکردو لە بەردەوام بونیان لەسەر ئەوە وریای دەکردنەوەو باسی سزای دۆزەخو خراپترین چارەنوسی یانی دەکرد، بەڵام من بڕوام وابوو ئەم قسانە زیادڕەوییان تێدایە.

یەکێ لەو ئامۆژگارییانە وتاربوو لەسەر کەناڵە ئاسمانیەکانو خراپەکەیان، ئەوەم لە مزگەوت گوێ لێ دەبوو بە نارازی بونەوە گوێم بۆ دەگرت.

زۆرجار هەندێ پەڕەیان دەدامێ، کاتێ دەمکردنەوە ئەو بەسەرهاتانەیان تێدابوو کە کەناڵە ئاسمانیەکانیان بە خراپ باس دەکردو نەدەچونە هزرەوەو وەکو داستانی ئەفسانە دەهاتنە بەرچاوم، لەدڵی خۆمدا دەموت: بۆچی ئەو کەسانە ئەو قسانە دەکەن؟

بۆچی ئەوانە خەمی ماڵو خێزانم هەڵدەگرن؟ بە شوێن وەڵامدا دەگەڕامو نەمدەدۆزییەوە، کە قەناعەتم پێ بکاتو ڕێگام پێ بگرێ، کە سەتەلایت نەکڕمو لەسەر ویستنی سور نەبم.

قسەی برادەرانم لە ڕاست مۆندیالەکانی موشەففەر کە ژمارەی نهێنی یان هەیە هانی دام هەنگاوی گەورە بنێم کە لەخۆی بگرمو لە بەرامبەریدا دابنیشم، وە کەناڵی (جەزیرە) بەرنامەکەی (وجها لوجه) هانی زۆری دام بیکڕم، دیسان هاوڕێیان لەکاتی ئیشدا لەبارەی هەواڵەکانی ڕۆژو مەیدان قسەیان دەکردن، هەموو ئەوانە تاویان سەندو هانیان دام ئەو نەفرین لێ کراوە بکڕم، بەڵام بەهۆی شەرم کردنم لە کڕینی، هەندێ دوای خستم لە کڕینی دا، بەڵام ئەو هۆکارانەی باسم کردن لەدوایی دا سەرکەوتنیان بەدەست هێنا.

ئەم میوانە شومە هاتە مالّم، بەلاّم نەك خوار زەوی بگریّ، بەلّکو شویّنی خۆی لەسەربانی مالّم گرتو، کاتیّ خەلّکی ئەو سیّلّەیان بینی بەرەو لای من رایان کردو وتیان: مەیکرەو لەخوا بترسەو ئاکامی خراپی لیّ دەکەویّتەوە، بەلاّم خۆراگر بووم وەکو پالّەوانەکانو شەیتان دالّدەی دام ئیحای بۆ کردم لەسەر کارەکانی پشتی گرتم، کۆمەلّگاو دراوسیّکان بە تاكو بە دەستە بە رەنجەرۆیی گەرانەوە.

بەو سەرکەوتنە خەیالّی یە بەسەر کۆمەلّگاو دراوسیّ ئامۆژگارەکانمدا بەدەستم هیّنا ژنو مندالّەکانم پیرۆزباییان لیّم کرد. ویستم وەکو دیارییەك بۆ ئەو پیرۆزبایی یە پیّشکەشیان بکەم.

رۆژگار رۆییو رۆژ بە رۆژ خولیام پتربوو بۆ ئاخاوتنی مۆندیالەکانو ئەو قەناتانەی زۆربەی خەلّکی سەیری دەکەنو کەم وایە توشیان نەبوبیّت، مەگەر کەسیّ خوا رەحمی پیّ کردبیّت. دیسان زۆر شاییم بەخۆم دەهات، کە ئەوەی لە سەتەلایتدا بینیومەو بیستومە دەمگیّرایەوە.

رۆژ بە رۆژ هەستم دەکرد چلّیّسی دەرونیم هەیەو حەز ناکەم لیّ ی بیّبەش ببم.

لیّرەدا بەتالاّیی هەیە دەبیّ پری بکەمەوە، هەستم دەکرد لە چونە مزگەوتو خویّندنی قورئان سستی دایگرتومو حەزدەکەم هەمیشە

بەدیار ئەو کەناڵانەوە بمێنمەوە، ماوەیێ بەسەرچوو وازم لە مزگەوتو ئەهلی باشی مزگەوت هێناو، لە قورئان خوێندنو وانەی زانسی دابرام. خەمو پەژارەش هەر دایدەگرتم، بەڵام لەسەر ئەم مانەوەیە پێ داگرتوتر بووم.

ئەوانەی منیان قەدەغە دەکرد بە دوژمنی ئازادیم لە قەڵەم دەدان، ڕۆژانو مانگان ڕابردون خۆمو خێزانم لەدەوری ئەو دەزگایە خراپە دابوینو تەنیا کاتی چوونە سەر کار لێ ی دور دەکەوتینەوە، زۆر بە ناچاری یەوە دەخەوتمو منداڵەکانیشم تا درەنگی شەو ئێشکەیان دەگرت بەدیارییەوە.

دوای چەند ساڵ بەهۆی سەرقاڵم بوونم بە ئیشو کارمەوە بوارم نەما بەدیار سەتەلایتەوە دابنیشم، جار هەبوو کاتی بەیانی دەگەڕامەوە، وام لێ هات بەسەرهاتەکانی مەسەلەی سەتەلایتم هەر لەیاد نەما. شەوێکیان درەنگ بوو گەڕامەوەو دەرگای ژورەکەم کردەوە لەسەر جێگام پاڵ کەوتم، بێ ئەوەی کەس بە هاتنەوەم ئاگاداربێ. یەکەمجار بوو گوێم لە غەلبە غەلبێ بوو، گوێم هەڵخستنو نەمتوانی لەو ورتەیە تێ بگەم، دڵم بە خێراتر لێ ی داو خەمەکی سەیر دایگرتمو بۆ یەکەمجار لە ژیانمدا دودڵیم بۆ پەیدا ببێت. منیش ڕاستەو ڕاستی ئەو دەنگە ورتە ورتەیە ڕۆیشتمو بەرەو ژوری ژنەکەم

ڕۆیشتمو ژورەکەم کردەوە بینیم لەخەودایە، ئەوکاتە هەناسەیەکی هێمنم داو گومانم ڕەوییەوە، کە دڵمی داگرتبوو گوشی بوو سوپاسی خوام کردو چومەوە ژوری خۆم، بەڵام دەنگەکە هەر لە ژورەکەدا دەهاتو گوێ بیستی دەبوم. ئەوەبوو گەیشتمە بەر دەرگاو بە تەواوی دڵنیابووم ورتە ورتەکە لەم ژورە بەدەر نییە. جارەکی تر گومانم وابرد کە ڕەنگە منداڵەکان تەلەفزیۆنیان نەکوژاندبێتەوەو دەنگی ئەوبێ‌و ئەوان نوستبن. من بەهێوری ڕۆیشتم تا بزانم چ باسە. گەیشتمە بەر دەرگاو زانیم دەنگەکە لە ژورەکەوەیەوە، دەستم برد بۆ کێڵۆنی دەرگاکە بینیم داخراوە، پاشان لە کونی دەرگاکەوە سەیرم کرد، بەڵام بێ سودبو. دەرگاکە قایم داخرابوو، گومانم لەدڵدا پەیدابوو دیسان دڵم خێرا دەستی بە کوتان کرد، خەریکی مەلا بانگدان بوو، هێشتا منداڵەکانم قسەیان دەکرد، گەڕامەوە ژورەکەم بەڵام لەسەر مەسەلەکەی خۆم سوربومو هەڕەشە بۆ سبەی دەبێت. بەر لەوەی بچمە ژورەکە دەرگایەکی ترم کەوتەوە یاد، ئەکەوتە لایەکی ترەوەو ڕوم لەوێ کرد، کاتێ چوم دەستم بۆ دەرگاکە برد بە ئاسانی بۆوە. سەیرم کردو ڕوانیم، بەڵام چیم بینی .... خودایە چی بکەم ... شتەکی چاوەڕێ نەکراوم بینی، بەڵکو کارەساتو کلۆڵی یەکەو برینەکی هەمیشە کولاوەیەو ئابڕوچونەو لەوە تاڵتر نییە. ئەی هاوڕێ

بینیم کوڕەکەم چووەتە لای کچەکەمو لە کچی کردووەو ڕێزی شکاندووە، ئەوکاتە خۆم بۆ نەگیراو هاوارم کردو بورامەوە، خێزانم لەترسانا هەڵسایەوە تا تراژیدیاکە خۆی ببینێت شتەکی بینی، کە قەت بیری لێ نەدەکردەوە، کە ئەوەیە برا هەتکی خوشکی بکات ئاهو هەزار ئاهو لەدەست ئەو سیڵە شومە، کە ئابڕوی ماڵمانی بردو حاڵەکەی شێواندو وردە وردە ئابڕوو داوێن پاکی یەکەی بردو، کچە بیست ساڵەکەم دەبێ چاوەڕێی منداڵەکی بیژی بکات لە براکەی (خوا پەنامان بدات)! بەختەوەری خێزانم، کە چاوەڕێی داهاتوی دەکرد لەژێر باڵی ئەو سیڵە خراپەیە لەدەست چوو.

## بەسەرهاتی (١٧)

## لە یەکێ لە سالۆنەکاندا :

یەکێ لە تۆبەکاران خۆی کە پالەوانی بەسەرهاتە بەسەرچوەکەیەو خۆی گەواهی دەرو شاهید حالەکەیە دەگێڕێتەوە:

لەگەڵ خاوەن سالۆنەکی ناودار بە بڕە پارەیەك ڕێك کەوتم، کە بە کامێرای شاراوە وێنەی کڕیارو مەعمیلەکانی بگرێت.

کامێراکانی لە ژوری ئارایشکردنی بوکەکان دانا، کە بە دانانی جلو بەرگیان هەڵدەستان، خاوەن سالۆنەکە بە بیانوی ڕوناك کردنەوەو نەبینین کامێرای تێ ئەکردن، خۆمان دەستاو دەستمان بەو کاسێتانە دەکردنو لەدانیشتنی تایبەتی دا سەیرمان دەکردنو دەستاو دەستمان پێ یان دەکردو، هەندێکمان کەسانێکمان لەوانە دەناسین، یان هەندێ لە کەسایەتی یە ناودارەکانیان. جارێکیان خاوەن سالۆنەکە دوا کاسێتی بۆ ئامادەکردم، کە بەپێی گرێبەستەکە بۆی تۆمار کردبوم، تەنیا لەقتەی یەکەمم بینی، چونکە بە پەلە بووم، لەبەر زۆر بە دڵ بوونم بە پەلە قلەکی ترم گرتەوەو بەسەر برادەرانمدا دابەشم کرد. ئێوارە کۆبوینەوەو دانیشتین تا شریتەکە ببینین، لەکاتی سەیرکردنی دا دڵی هەموانی بزواند، دانیشتنەکە بێ قسەکردن

نەبوو، تا ئەو لەقتە یەکلاکراوەیە هات، کە ئەم خانمە دانیشت، کە هێشتا ڕوخساری بەدەر نەکەوتبوو، بەڵام کە دانیشتو خاوەن سالۆنەکە هاتە پێشیو خاوەن سالۆنەکە پیٚی وت جلەکانی پتر دابنێ تا بتوانێ کارەکەی سەرکەوتوو تر بکات، گەر نا جلەکانی پیس دەبن. لێرەدا لەگەڵ فیکەی برادەرانمدا لەبەر جوانی بەژنو باڵای کە سەرنجی هەموانی ڕاکێشا من بە حەپەساوی هەڵوێستەیەکم کرد ... خێزانمە ... خێزانمە، کە هەڵسام لەڕێگای ئەو کاسێتەوە لەشی ئەوم تێدا نمایش کردووە بۆ برادەرانمو کەوتۆتە بەردەست زۆربەی ئەوانیشەوە خوا دەزانێ ئێستا سەری بە کوی گەیشتووە؟

هەڵسام شریتەکە لە ڤیدیۆکە دەربکەمو بیشکێنمو هەموو شریتەکانی لە دەورمەوە تێکیان بشکێنم، کە هەمیشە شانازیم پێوە دەکردن، چونکە خۆشترین کاسێتی کچانی خێزانە ناودارەکانم دەست کەوتبوو، کە دەگمەن بونو زۆر لەوانە شاراوەبون. کاتێ لەو پاڵەوانە پرسیار کرا، ئەی خێزانتو منداڵت قەدەغە نەکردبوو لە چوون بۆ سالۆنەکان؟ وتی: بەڵێ، بەڵام بێ ئاگایی من لەگەڵ خوشکێکی دا چووبوو، ئەمەش داهاتوو زانیمەوە.

ئەی چیت بەو کاسێتانە کرد ئایا هەمووت کۆکردنەوە؟ وتی: بەپێچەوانەوە کە زانی یان ئەمە ژنی منە برادەرانم زیاتر لەبەریان

گرتەوەو دابەشیان کردن، بەڵکو کام هاوڕێیە نزیکترینیان بوو زیاتر دابەشی دەکردن.

لەکۆتایی دا زانیمان ئەوە سزای خوایە، چونکە ناموسی خەڵکیم حەڵاڵ کردبوو، لەم گرفتە سودی زۆرم وەرگرت، زانیم خودا حەقەو گەڕامەوە ڕێی ڕاستو چاکەو خراپەم لە هاوڕێکانم زانی، زانیم هاوڕێی خراپ هەر خراپەو ئەم ژیانە قەرزو قەرزدانەوەیە.

لە فەرمودەدا هاتووە(..... لا تأذوا المسلمين، ولا تعيروهم، ولا تتبعوا عوراتهم فانه من تتبع عورة اخيه المسلم، يتبع الله عورته، ومن تتبع الله عورته يفضحه ولو في جوف رحله) رواه الترمذي/ اسناده حسن.

واتە: ئازاری موسڵمانان مەدەنو جنێویان پێ مەدەنو سۆراغی شەرمگەیان مەکەن، کێ سۆراغی شەرمگەو ئابڕوی برای موسڵمانی بکات خوا سۆراغی شەرمگەو ناموسی دەکات، کێ خوا سۆراغی بکات ئابڕوی دەبات گەر لەناو سوچی ماڵەکەشی دابێت.

# چیرۆكی (١٨)

## چیرۆكی دووەم هەر لە ساڵۆنێكدا

گەنجێ بەسەرهاتەكی بۆ گێڕامەوە، كە لە ساڵۆنێكدا ڕوی داوە، جارێكیان بۆنەیەكی زەماوەندی هاوسەری لە ئارادابوو، خۆمو خێزانم چوینە ناو یەكێ لە ساڵۆنەكانەوەو لەبەر ساڵۆنەكەدا دامبەزاندو كچەكی بچوكی لەگەڵدابوو، پێم گوت: دوای كات ژمێرێك دەگەڕێمەوە.

دوای ئەوكاتە گەڕامەوە بینیم دور لە ساڵۆنەكە وەستاوەو سواری ترومبێلەكەم كردو بە سەرسوڕمانەوە لێم پرسی: بۆچی لێرە وەستاویت؟ وتی: خاوەن ساڵۆنەكە گلاسێ شەربەتی پێدام هەستم بە سەر سوڕان كردو خەریك بوو ببورێمەوە، هەستم بە ترس كرد، دوای ئەوەی مۆبایلی لەگەڵ پیاوێكدا دەكردو دەیوت: نایەی كچەكەت ببەیەوە. زانیم ئەم ماستە مووێكی تێدایە، بۆیە تەنیا ڕاكردنم بەدەستەوە ماو كچەكەم بەدوای خۆمەوە ڕاكێشا. وا دیاربوو ئەوان ترسان بۆیە بە كچەكەوە هاتنە دوای من! دوای ماوەیەك لە ڕاست ئەم ساڵۆنە پرسیارم كرد، كە داخرابوو، وتیان: داخراوە چونكە شوێنێك بووە بۆ خراپكاری. (خوا پەنامان بدات)!

## چیرۆکی (١٩) :

**خانمێك ماوە ماوە سەردانی سالۆنەكانی دەكرد، گەیشتە قەناعەتێكی گەورە، كە ئەو سالۆنانە تەنیا پەردەیێكن زۆر كاری خراپیان لەپشتەوە دەكرێت. ئەم خانمە دەڵێ:**

من وەكو ژنێ بۆ مەبەستی ئارایشو جوانكاری تایبەت بە ژنان دەچوومە سالۆنەكانی ئارایش، بەزۆری سەردانی سالۆنەكی ناودارم دەكردو بوبوم بە كرێ گرتەی ئەوان، ئاوا مامەوە تا ڕۆژێكیان سەیرم كرد گەنجێ چووە سالۆنەكەو، وام زانی هاتووە لەگەڵ ژنەكەیدا یان بۆ نمونە خوشكەكەی دا بڕواتەوە، بەڵام بینیم بەڕێوەبەری سالۆنەكە بە گەرمی یەوە پێشوازی لێ كردو بردییە ژورەكی لاوەكی یەوە، پاش ماوەیەك گەنجەكە لە ژورەكە هاتەدەرو ڕۆیشت. سەرەتا گرنگیم بەمە نەدا، هەرگیز بە خەیاڵمدا نەدەهات ئەم سالۆنە ناودارە كاری ئاوا لەخۆی بوەشێنێتەوە.

نەم دەزانی ئەم سالۆنە بۆ مەبەستی تریش بەكاردێ. بەڵام جاری دووەمیش هەمان هەڵوێست دوبارە بۆوەو گەنجێ چووە ژورو بەڕێوەبەری سالۆن پێشوازی گەرمی لێ كردو بردییە هەمان ژورەوە، دوای ماوەیەك كە گەنجەكە هاتەدەرو چەند خولەكێكی برد كچێكی لێ هاتەدەر، كە لەم سالۆنەدا ئیشی دەكرد، ئەم دیمەنە وروژاندمیو هۆشیاری كردمەوە، ڕۆژگار بۆی سەلماندم ئەم سالۆنە جێگای خراپەكاری ناشەرعی یە. (خوا پەنامان بدات) .

## چیرۆکی (٢٠)

## لەگەڵ شارەزایەکی ئارایشتدا :

یەکێ لە خانمە پسپۆرەکانی جوانکاری بەسەرهاتی کاری خۆی لەناو سالۆنەکاندا بەیان دەکاتو دەڵێ: کاتێ لەوڵاتی خۆمەوە گەیشتمە ئەوێ ویستم بەدوای کارێکدا بگەڕێم لەشانی من بێو لەگەڵ شارەزایی مندا بێتەوە، ڕۆژێکیان چاوم بە ڕیکلامێ کەوت لە ڕۆژنامەیەکدا نوسرابوو، کە یەکێ لە سالۆنەکان پێویستی بە فەرمانبەرێ هەیە، منیش بە پەلە بەداوایەوە چووم تا ئەو هەلە لەدەست نەدەم، کاتێ خاوەن سالۆنەکە چاوی پێ کەوتم گورج قایل بوو. کارەکانی خۆم بە ڕێکی دەکردو زۆر بە کارەکەم دڵخۆش بووم، بەڵام ئەم کامەرانیە تەمەنی درێژ نەبوو، بینیم زۆر کاری نائاسایی هەیە لەبن پەردەوە ئەنجام دەدرێن، هەستم کرد داواکاری دەرەکی زۆر لەو سالۆنەدا لەکاتی ئیش دا ڕوودەدەن. ئەوەها تەلەفۆن زایەڵەی دێو خاوەن سالۆنەکە بە گومانەوە قسەی پێ دەکاتو وەڵام دەداتەوە. پاشان بە یەکێ لەو ستافانەی سالۆنەکەی دەوت: بڕۆ لە دەرەوە کاریان پێتە ... قاقای پێکەنین بەرز دەبۆوەو دەچووە شوێنی دیاریکراو تورەگەکی پێ بوو وام دەزانی ئامرازی ئارایشی تێدا

دەبات. لێرەدا شوفێرەکی تایبەت هەبوو دەیبردو دەیهێنایەوە، کاتێ کچەکە دەگەڕایەوە، ئەو برە پارەیەی دەیهێنایەوە دەدەستی خاوەن سالۆنەکەی دەکرد، تا دابەشی بکات لەنێوان خۆیو خۆیدا. ئەوەی گومانی بۆ دروستکردم لە تەواوی کارەکانیاندا ئەوەبوو تا من لەگەڵیاندا بچم بزەیان دەگرتو دەیانوت: ئێستا نەء . ئاوا بەسەرگەردانی دەمامەوە، تا ڕۆژێکیان بۆم ئاشکرابوو ئەو داواکاریە بۆ ئەوانەیە ئامادەیی یان تێدایە بۆ برە پارەیەك ناموسی خۆیان دەفرۆشن.

# چیرۆکی (٢١)

## بەسەرهاتێکی تراژیدی ئەنتەرنێت(سەرەڕۆیی هەرزەکارێك) :

دەسپێکی ئەم باس و خواسە بە تراژیدیای مودمینێکی شەڕاب و مەی دەست پێ دەکات، کە خۆی لەبەردەم ئەفسەرێکی لێکۆڵەردا لە سەردەمی لاوی دا دان بە تاوانەکەی دا دێنێت. کە ئەو بەر لە سێ ساڵ لەرێگای دۆستەکەیەوە (مەها)وە بە (شیرین) ئاشنا دەبێ، کاتێ سەردانی ئەو شوققەیە دەکات، کە بۆ خواردنی ماددە هۆشبەرەکان (المخدرات) بەکرێی گرتبوو. هەر لەو ساتەوە ئاشنایەتی نێوان ئەو لاوەو شیرین دروست بوو، ئەنجا پەیوەندییان بە زویی گەرم و گوڕ بوو، هەمیشە بانگی دەکرد بۆ شوققەکە بۆ شەونخونی و خواردنەوەی ماددە هۆشبەرەکان. دەڵێ: من رۆژ بە رۆژ لێ ی نزیکتر دەبومەوەو وەکو هاوسەران کاتمان بەسەر دەبردو کێشەی نەبوو لە دۆخی ئیدمانی تەواودابوو، قەت حەڵاڵ و حەرامم لە یەکتری جیا نەدەکردەوەو لە ژیانماندا هیچ جڵەوێ نەبوو قەت بایەخی بەوە نەدەدا کە دوای شەونخونی زوو بڕواتەوەو، هەمیش لێم دەپرسی: ئایا خێزانت لێت ناترسن و لێت ناپرسنەوە، کە لە کوێ بووی؟ بۆچی دواکەوتیت؟

هەرکاتێ دەگەڕایەوە ماڵەوە دوای شەوخونی کێشەی بۆ دەنانەوە، تا ئاستێ کە لەگەڵی دا ڕاهاتبون. ڕۆژێکیان لە کاتەکی چاوەڕوان نەکراودا لە دەرگای ماڵەوەمانی دا جانتای جلو بەرگەکانی پێ بوو، ڕایگەیاند لە ماڵەوە دەریان کردووەو ناچاربوو بێتە لای من لە شوققەی ماڵەوەماندا دەژیا، کە دایکم لەگەڵمدا بوو، کە دایکم لێمی دەپرسی، دەمگوت: هیچ لە گۆڕێ نییە، ئەوە هاوڕێمە لەگەڵ خێزانی دا زویر بووەو داهاتوو چاك دەبنەوە. زیاتر لە ساڵێ شیرینو دایکم لەگەڵمدا ژیانیان بردە سەر، دوایی لە مەسەلەیەکی ماددە سڕکەرەکان (المخدرات)دا زیندانی کرام، بەهۆی ئیدمانی ئەو ماددانەوە زوتریش گیرابووم، دوای دەرچوونم لە زیندانی، بینیم شیرین لەگەڵ دایکمدا دەژیو جارەکی تریش بۆ ئیدمان گەڕاینەوە.

ئەفسەرەکە لێ ی پرسی: کێ شیرینی کوشت؟ ئایا ئەو ژنت بوو یان دۆستت بوو؟ گەنجە دان بە تاوانەکانی دێنێو دەڵێ: کاتێ لە زیندانی بووم بەردەوام شیرین سەردانی دەکردم، کاتێ دەرچووم شوققەیەکمان بەکرێ گرتو ڕامان خست، چونکە هەندێ هێروینمان فرۆشت، کاتێ من لەناو شوققەدا زۆر لەباربووم داوام لێ کرد بیکەمە هاوسەرم، ئەویش ڕازی بوو. بەڵام هاوسەرگیرییەکە بێ

هۆشی بوو، چونکە ئەو کات مادده هۆشبەرەکانمان دەخوارد. کتەو پڕ ئەفسەرەکە لیّ ی پرسی: تەرمی شیرین لە کوێیە؟

زۆر بەئاسانی وتی: لە شوققەکەمە. لێرەدا ئەم ئەفسەرە دەستەیەك هێزی پۆلیس بانگ دەکاتو بە ڕاگەیاندنی بەڵگەکانی تاوانی هەڵدەستیّو هێزەکە دەگاتە شوققەکەو کوڕەکەشیان بە کەلەپچەکراوی لەگەڵدایە. ئەو شوققەکەی کردەوەو هێزەکە چونە ژور، بۆنی کەلاکێکی پیسیان کرد، لەو شوققەیەشدا تەنیا چەند کەلو پەلیّ هەبوو، تەرمی شیرینیان لەوێدا دۆزییەوە، پشتی دابوو بەدیوارێکەوەو جلی نوستنی لەبەردابوو، وای نیشان دەدا ماوەیەکە مردووە، چونکە شینو مۆر بوبۆوەو سرنجەکی لەلابوو شوێنەواری خوێنی پێوەبوو. پیاوانی بەڵگە تاوانیەکان (الادله الجنائیه) هەڵسان شوێنە مۆری ناو ژورەکەیان کێشا، لەوانە زۆر شتی حەرامیان بینی خوێنیان پێوەبوو، سرنجی هێرۆیینی لیّ بوو بۆ لێدان ئامادە کرابوو، تەپڵەکە جگەرەی لیّ بوو، پڕ لە قونکە جگەرە بوو، پاشان تەرمی شیرین تاوی درایەو گەنجەکە یەخسیر کرا، تا وەرگرتنی ڕاپۆرتی پزیشکی شەرعی دەست بەسەرکرا، ڕاپۆرتی پزیشکی شەرعی هات جەختی لەسەر ئەوە کردەوە، کە هۆکاری مردنی هیرۆیینی زیادبووەو دڵی وەستاندووەو بەرگەی ئەو ژەمە زۆرەی نەگرتووە. لە

لێکۆڵینەوەدا تاوانبار دانی بەوە دانا، کە خۆیو شیرین ماددەی هۆشبەریان خواردووەو، بەر لەوە کاری سێکسی لەگەڵدا کردووە، پاش ئەوەی نوستووە ژەمەکی (الجرعة) تری داوەتێ لە هیرۆیینو بەرگەی نەگرتووەو مردووە.

کاتێ هەستی بەمە کردووە، کە لە خەو هەڵساوەو بینیوە لەسەر جێگادا کەوتووە. ڕاپۆرتی پزیشکی شەرعیش ئەوەی سەلماند، کە پەنجەکانی سەر باسکی کچەکە هەمان پەنجەی ئەو کوڕەن. بۆیە گەنجەکە بە تاوانی کوشتنی ئەو کچەیە بە ژەمە زۆرێکی هیرۆیین پێنج ساڵ زیندانی کراو پاشان بەرەو نەخۆشخانەی پزیشکی دەرونی ڕەوانەکرا بۆ چارەکردن، تا دوای ئەوە بۆ زیندانی بگەڕێتەوە بۆ تەواوکردنی ماوەی بەندی یەکە.

دوای هەموو ئەو شتانە چی بڵێین؟ بە کێ بڵێین؟ کوا خێزان؟ ئەی کاری ئەو لە ڕاست خێزاندا کوا؟ بۆچی بە ها ڕەواو ناڕەواکان فێری لاو ناکات. بۆچی فێرە نوێژی نەکردووە؟ یان ئایەتەکی قورئانی پێ دەرخ نەکردووە؟ بۆچی ئەوانە خۆیان لەسەر ڕەوتی ئایینی ڕاناهێنن؟ ئەمە بەرپرسیارییەکی گەورەیە، نەك هەر لاو بەڵکو خێزانیش هەڵی دەگرێو ئەو قوربانی باوانیشە، کە بە ئەرکی بنەڕەتی پەروەردەی منداڵەکان هەڵنەستاون.

# چیرۆکی (٢٢)

## ژوانێ لە شالی یەدا :

ئەمە بەسەرهاتێکی واقیعی یەو مەبەستیش پەند لێ وەرگرتنیەتی، حەقیقەتی ئەم بەسەرهاتەش لە یادی خوێنەری دا ڕەش نابێتەوەو پەندی تێدایە بۆ هەر کەسێ، کە قەدەغەکراوەکان پێ شێل دەکاتو گاڵتە بە کچی خەڵکی دەکاتو پێیان ڕادەبوێرێت.

ئەمە سەربوردەی پیاوێکە هەموو خەمێکی لەخشتە بردنی کچان بووە،کە بە قسەی شیرینو لوس فریوی داونو بەڵێنی بە درۆی پێداون، کاتێ کاری خۆی بەجێ هێناو، بازی داوەتە سەر کچێکی ترو ئەوی فڕێ داوە، ئەم گەنجە هیچ پەرژێنێکی ئابروو دینی نییە پێشی پێ بگرێ، وەکو دڕندەیەکە لەدەشتەکی دایە کوێرانە شوێن نێچیرێ دەگەڕێ برسێتی خۆی پێ بشکێنێت. لەگەشتێکی دا کچێکی دەکەوێتە ناو تۆڕە فریوددرەکەیەوە، کە بە نمونەی کەسانی وەکو ئەو لەخشتە دەچن، ئەودبوو ژمارەی مۆبایلی دەداتێو پەیوەندی پێوە دەکاتو گوێ بۆ قسە بەتامو شیرینەکانی دەگرێو وای لێ دەکات لەجیهانی خۆشەویستیو ئەویندارى دا مەلە بکات، وای لێ کرد دڵی عەودالی خۆی بکات. ئەو نەگریسە ویستی دوای ئەوەی زانی کەچی کردووە دۆخەکەی هەراش بووە، کاتی ئەوە نەهاتووە بەرەکەی

بچنێتەوە، وەکو چۆن رابردو ئەنجامی داوە. بۆیە ویستی فریوی بدات‌و لەخشتەی ببات. بەڵام کچەکە بەرەو روی بۆوەو پێی وت: بە هاوسەرگیری شەرعی نەبێ نابێ توخنم بکەویت، چونکە خۆشەویستی ئێمە پاکە لەنێوانماندا. کابرا زانی پلانی ئەو جارەی سەری نەگرت، بۆیە ویستی تۆڵە بۆ لەخۆبایی بوونەی بکاتەوەو وانەیەکی بداتێ قەت لەیادی نەکات. بۆیە پەیوەندی پێوە کردو سۆزو ئەوینی قوڵی خۆی بۆ گوزارش کردو، پێی وت من سورم لەسەر ئەوە کە دەبێ داخوازیت بکەم، چونکە تۆ بۆ من وەکو ئۆکسجینی ناتوانم لێی دابڕێم، ئەگینا دەمرم. چونکە کچەکە سادە بوو فریوی بەو خۆشەویستی یە خواردو لەگەڵ ئەو سەودای عیشقی خۆی بۆ کردەوە. بەردەوام ئەو خراپکارە ئیحای بەدی خۆی بۆ کرد بە پەیوەندی تەلەفۆنی تا کڵپەی خۆشەویستی یەکەی گەیاندە دوند، بەڵێنی دایە داهاتوو دێتە داوای، بەڵام لێرەدا چەند کارێ هەیە لەسەر هێڵی تەلەفۆن ناگوترێن دەبێ دوبەدو باس بکرێن، کە پەیوەندی بە ژیانی هاوسەری داهاتوی ئەوانەوە هەیەو، هەر دەبێ یەکتری ببینن، دوای ئەوەی رەفزی دەکات‌و دەستی بە رویەوە دەنێ قایلی دەکات، کە ژوانی دەکات، ئەم خراپکارە دڵی خۆش بو،

جێگاو شوێنی بۆ دیاری کرد، شوێنەکەش شالی یە بوو لەسەرکەناری دەریاو، کاتەکەش سەر لەبەیانی بوو، هەردوکیان رێك کەوتن.

ئەو نەگریسە چەپەڵە لەگەڵ هاورێیانی هاوشێوەی خۆی دا قسەی کرد کە سبەی کچێ دێتە شاڵی یەو بەدوای مندا دەگەڕێ، دەمەوێ لەوێ بن هەموو شتەکی لەگەڵدا بکەن. سبەی لەشالییە دانیشتنو چاوەڕێی نێچیرەکە بوون، لەو کاتەدا کچێ هات بانگی لێوە دەکات، ئەوانەش وەکو درندە هێرشی بۆ دەبەنو ناموسی دەشکێنن، پاشان لەپەلو پۆپی دەخەنو لەحاڵەتێ دا بەجێی دێڵن شینی بۆ بکرێ، برادەرەکان بەرەو ترومبێلەکەیان رایانکردو سوار بونەوە، ئەو فێلاوییە پیسە بەرەو رویان هات کاتێ بینیان بەرویدا پێ کەنینو وتیان چۆنت ویست وامان کرد.

گەنجە دڵی خۆش بوو لەگەڵیاندا چووە شالییە هەتا تاوێ بە بینینی ئەو بەستە زمانە ئاو بخواتەوە، کە لەدڵی داوەو قسەی شکاندووە.

کاتێ چاوی پێ کەوت کە خەریکە گیانی دەربچێ، هاواری کرد بە برادەرانی دا ئەی بێ نرخینە ئەوە خوشکمە، چیتان لێ کردووە، ملتان بشکێ، ئەوە خوشکمە، ئەی هاوار....بەڵام چی قەوما! خوا ویستی تۆڵە لەو خراپکارە بکاتەوە، بەهەمان نەخشە کە دایڕشتبوو،

ئەوەبوو ئەو کچەی پلانی بۆ دانا بوو، کۆسپەکی هاتە پێش نەیتوانی ئامادەبێ، بەڵام خوشکی ئەو لاسارە ئیشی بە کاکی دەبێ دێ سۆراغی بکاتو دەشزانێ بەزۆری لەشالییە دەسوڕێتەوە، بۆیە لەهەمان ژواندا لەوێ ئامادە دەبێ، بەم شێوەیە ئەم خراپەکارە ئەو چاڵەی بۆ ئەو کچەی لێ دابوو خوشکی خۆی کەوتە ناوییەوە! ئەمەش چارەنوسی هەموو خراپکارو ستەمکارانە.

## چیرۆکی (٢٣)

## مامۆستایەکی ئافرەت و قوتابی یەکی کچ:

یەکێ لەمامۆستایانی ئافرەت دەڵێ:

داستانەکە بەوە دەست پێ دەکات، کە یەکێ لەقوتابیانی کچ دێتە ژوری من، دەستی بە مامۆستایەکی قوتابخانەکەوە گرتبوو، بە تەواوی روخابوو لەحاڵێکدا بوو مرۆڤ بۆی بگرێیت، ویستمان لەگەڵ مامۆستاکەدا هێمنی بکەینەوە، بەڵام بێ هودە بوو. داوام لێ کرد دابنیشێ...ئەنجا قورئانەکەم دایە دەستو سورەتی (یاسین)م بۆ کردەوە بیخوێنێ تا ئارام ببێتەوە. خوێندکارەکە قورئانەکەی بە ئارامەوە وەرگرت و دەستی کرد بە خوێندنی قورئان، خۆشم دەستم کردەوە بە کارەکانی خۆم. من بڕوام وا بوو ئەم کێشەیە لەوە بەدەرنییە، کە پەستی یەکە، یان فشارێکی دەرونییە، یان خۆشەویستەکی مردووە، یان بارەکی تر کە رۆژانە بەسەر کاردا دێن.

قەت نەمدەزانی ئەم خونچە جوانە خەمێکی هەڵگرتووە شانی یەك خێزان قورس دەکات. قوتابییەکە هێور بۆوەو بە چەند هەنگاوێکی نزیك لێم هاتە پێشەوەو زۆر خەمبار بوو لەبەردەممدا دانیشت.

زانیم هاتۆتەوە سەرخۆو دەتوانێ قسە بکات، ئەنجا وتی:

سەرەتای بەسەر هاتی مـن لەگـەڵ دەسـت پـێ کردنـی پـشووی هاوینەی خوێندنی رابردوو دەست پێ دەکات. دایکم لەگـەڵ باوکمـدا گەشتێکیان کرد بۆ هەندەران بەمەبەستی چارەسەرکردن، بەچـاودێری پلکمی، کە نیمچە نەخوێندەوار بوو لەگەڵ خوشکی بـچوکمی بـەجێ هێـشتم، مەبەسـتم لەنیمـچە نەخوێنـدەوار ئەوەیـە کەخوێنـدەواری هەبوو، بەڵام لەراسـت کاروبارەکـانی ژیـان وفەلـسەفەکەی رۆشـنبیر نەبوو. من هەستم بەشەکەتیو پەسـتی دەکـرد، ئـەوە یەکـەم جـارە لەدایکم دابـڕێم. دەسـتم کـرد بـەرابواردن بـە ئەنتـەرنێتو چـەند جێگایەکی گەڕام. لـەژورەکی پڕلەغڵبـەغڵب دا وتووێـژم درێـژە پـێ دەدا، چونکە پەروەردەیـەکی بـاش کرابـووم لـەهیچ نەدەترسـام. تـا رۆژێکیـان گەنجـەکم دۆزییـەوە هـاوولاتی مـن بـوو لەشـوققەکی ترادەژیا. بەمەبەستی کات بەسـەربردن لەگەڵیـدا کەوتمـە ئاخـافتن، پاشان بۆ ژوانی رۆژانە گۆڕا. داوای لێ کردم لەسەر ماسینجر قـسەی بۆ بکەم، منیش لەگەڵیدا رێك کەوتم رۆژانە تا سـبەی قـسەی چـەند سەعاتیم بـۆ دەگێڕایـەوە.لـەکاتی ئاخاوتنەکـە هـەردولا یـەکترمان ناسیو بەسەر ژیانی یەکتریدا راگەیشتین. زانیم لاوەکی خاوەن بـەزمو رابواردنەو حەزی لەگەشـتەو هـەموو حـەرامێکی تـاقی کردۆتـەوە.

دیسان لەمەڕ هەندێ کاری بەسود قسەمان کرد لەراست ژیانـدا، بـە لیاقەی خۆم تـوانیم نوێـژی پـێ بکـەم...؟!دوای ماوەیـەکی کـورت راسـتەوخۆ خۆشەویـستی خـۆی بـۆمن دەرخـست، بەتایبـەتی کـە ئەوگۆڕاوە بەقەناعەتەوە رەفتاری گۆڕاوەو ژیـانی رابـردوی گەوجانـە بووە تا دوایی.

سەرەتا دڕدۆنگ بوم، بەڵام دوایی بیرم کردەوە کە ئالودەی بووم.

دیسان هەستم کرد، کە بەختەوەرترین کاتم ئەو کاتەیە لەدیـداری ماسینجر نزیك دەبێتەوە. پەیوەندی نێوانمان زۆر توند بـوو، تـاداوای لێ کردم ژوانی بکەمو منیش قایل بووم کە جێگایەکی گـشتی بـێو بۆ چەند خولەکێ بێ تا روخـساری مـن ببینێـت. رۆژی ژوان تـوانیم لەدەستی پـور(پلـك)م خـۆم دەربـاز بکـەم بـەو پاسـاوەی دەمـەوێ سەردانەکی دەستە خوشکەکەم بکەم، کە داوای لێ کردوم سەری لـێ بدەم. هەتا کاتی ژوانەکە هات دلّم رادەچڵەکی تا روبەڕو بینیم.

من نەم دەزانی ئەوەندە جوان بـێ، وەکـو لەداسـتانی خـەیاڵی دا دەڵێ(شۆڕە سواری خەونی من بوو). چەند خولەکێ گفتوگۆمان کرد، ئەویش روخساری منی زۆر بە دڵ بوو وتی: زۆر لەوە جوانتری کە من بیرم لێ دەکردەوە. پاشان بـەجێم هێـشتو بـە خۆشـحاڵی یـەوە بـۆ ماڵەوە گەڕامەوە، لەخۆشـیان گەشـکەم گرتبـوو. ئەوەنـدە دڵخـۆش

بوبوم تا هەڵس و کەوتم لەڕاست خوشکانمدا گۆڕاو بوبوم بە بڵێسیەك خۆشەویستی بۆ هەموو خێزانەکەم، خۆشەویستی ڕاست ئەوەی فێرکردم. شێوازەکی ترمان بۆ گفتوگۆ بەکار هێنا، ئاکامی هەموو ئەوانە ئەوەبوو، کە بەڵێنی پێدام، کە دوای گەڕانەوەی خێزانم دێتە داخوازیم...بەڵام من پەسەندم نەکرد تا خوێندنم تەواو دەکەم. ماوەی پشودانەکە سێ جار دیداری یەکتریمان کرد، هەموو جار بە قەدەر هەموو دنیا بە کامەرانی دەگەڕامەوە. لەم سەروبەبەنەدا خانەوادەم لەگەشتی نەخۆشیەکە گەڕانەوە، بەڵام چونکە چارەکردنەکە سەری نەگرتبوو پەستی کەشی خانەوادەکەمانی داگرتبوو. لەگەڵ دەست پێ کردنەوەی وەرزی خوێندن داوای دیدارێکی لێم کرد، بەڵام من پەسەندم نەکرد، چونکە لەگەڵ بوونی دایکم دا ناوێرم ئەم چاوپێ کەوتنە بکەم، بەڵام بەهۆی زۆری کردن، کە گوایە مژدەیەکی خۆشی هەڵگرتبووە قایل بوم.لەهەمان کاتی ژواندا چاومان پێك کەوت و ئەنگوستیلەی دەزگیرانی پێ دام، زۆر شادمان بووم و سوربو کە سەردانی خێزانم بکات، بەڵام بە بیانوی خوێندن قبوڵم نەکرد. هەمان ڕۆژ لەچەند ساتەکی لاوازی دا تەسلیم بە شەیتان بووین...کە چەند ساتەکی خەمۆك بوو، نازانم چۆن باسی بکەم و حەزناکەم هەر باسی

بکەم...من لەم کاتەدا خۆم لەبارەکی تردا دەبینی...قەت من نەبووم کەلەسەر رەوشتو ئابڕو رەنێو هێنراوم..

من کـچێنیم لەدەسـت داو لەگـەڵی دا نـاموسو ئـابڕوو شـەرمو هەموو شتێکم لەدەستدا. دوای ئەوە دڵنەوازی دەکردمو پەیمانی پێدام کە دێتە پێشەوە بۆ داخوازی. دوای ئەوە ئـەم ژوانـە بەمـە کۆتـایی هات، کـە دوایـی بـیری لـێ دەکەمـەوەو پاشـان کـاتی هـاتنی بـۆ داخوازیەکە دەستنیشان دەکەم. من بە دڵی شکاوو پەریشانییەوە بـۆ ماڵ گەڕامەوەو چەند رۆژێ لەماڵدا کـاتم بەسـەر بـرد تاقـەتم نـەبوو کەسێك ببینمو زۆری کارکردە سەر ئاستی خوێندنم، بەڵام ئەم کوڕەی هەموو رۆژێ دڵنیای دەکردمەوە کـە دێ بـۆ داخـوازی کـردنم. دوای ماوەیەکی کورت هەفتەیەك بێ سەروسۆراغ بوو، ئـەم ماوەیـەش بـۆ ئێمە زۆر بوو، کە بێ بەهانـە شـوێنە ون بـێ، هـەولم دا چـاوم پـێ بکەوێ نەم دۆزییەوە.

دوای ئەو ماوە درێژە چاوەڕێکردنە لەپۆستەی خۆمـدا نامەیـەکم لەو پـێ گەیـشت کـورتو سەرسـوڕهێنەر بـوو، لـەناوەڕۆکی حـاڵی نەدەبوم، داوام لێ کرد بە تەلەفۆن تێم بگەیێنێت. دوای کات ژمێرێ کە پەیوەندی پێوە کردم چاوم پێی کەوت زۆر خەمبار بوو داچۆڕابوو، هەولم دا لەهۆیەکەی بگەم، بەڵام سـودی نـەبوو، لـەهیکرا بـە کـوڵ

گریا، قەت پیاوێکم بەو دیمەنە زۆر گرینە نەدیتبوو!! لەبەر زۆری گریان هەڵدەلەرزیو هەنسکی دەهاتن، وام زانی کەسێکی توشی کارەساتێ هاتووە، هەوڵم دا هۆکاری خەمەکەی بزانم، بەڵام وەڵامی نەدایەوەو داوای لێکردم بۆ ماڵەوەم بگەڕێمەوە. سەرم سوڕماو وتم هێشتا کاتی نەهاتووە. پاشان داوای لێ کردم لەیادی بکەم. نەمزانی مەبەست لەم یادکردنەی چی یە...منیش گریامو بەوە تاوانبارم کرد کە دەیەوێ لەکۆڵ خۆیم بکاتەوە، بەڵام لەهیکرا دەستی کرد بە قسان!! قەت روی خەمۆکی ئەو لەیاد ناکەم کاتێ پێی وتم بەدرەنگەوە نەخۆشی یەك لەودا سەری هەڵداوە! مەبەستی کام نەخۆشیەیەو کام درەنگە؟ماناي چییە؟ دۆستەکەم توشی (ئایدز) بووەو کتو پڕبەرێکەوت بەمەی زانیوە. ئەمە بە کورتی بەسەرهاتی منەو هەمیشە سەرگەردانمو چارەنوسم نادیارە، منیش توشی هاتوم، ئێستا نازانم چی بکەم، چۆن بەم کارەساتە روم لەخێزانەکەم بکەمەوە؟یان چی بکەم.........؟

لێرەدا بە کورتی بەهەموو کچێك دەڵێین: خۆتان بپارێزنو گوناهە گەورەکان بە بچوك مەزانن، هەر گوناهەکی بچوك داهاتوو گەشەدەکاتو گەورە دەبێت!

# چیرۆکی (٢٤)

## هیوایەکی لەدەست چوو:

دایکی موحەممەدئافرەتێکی هەراشەو لەچل ساڵە گوزەری کردووەو بەسەر هاتی خۆی دەگێڕێتەوە:

ژیانەکی خۆشم لەگەڵ مێردمدا بەسەر دەبرد، هەرچەندە پێکەوە گونجانمان کەم بوو، مێردم ئەو کەسایەتیە بەهێزەی نەبوو لوتبەرزییەکانی من وەکو ئافرەت رازی بکات، بەڵام چاکیەکەی وای لێکردم چاو پۆشی لیّ بکەم، چونکە خۆم لەماڵدا بڕیاردەر بووم لەکاروباری ماڵەوەدا.

مێردم زۆر ناوی برادەرو هاوبەشەکەی دەبرد لەکارەکەداو، زۆرجار لەنوسینگەی تایبەتی خۆی دا، کە بەشێ بوو لەشوققەی خۆماندا بۆ چەند ساڵێ کۆبونەوەی لەگەڵدا دەکات. تا جارێکیان بارەکە هاتە پێش‌و بە خۆیی‌و خێزانیەوە سەردانی کردین، چونکە زۆر دۆستی مێردم بوو بەخێزانەوە سەری لیّ نەدەبڕین، وە نەمان دەزانی چەند جار سەردانمان دەکات‌و چەند کاتژمێر پێکەوە دادەنیشتین. تاجار هەبوو بە تەنیا دەهات لەگەڵ من‌و مێردمدا پێکەوە بە چەند سەعات دادەنیشتین. مێردم زۆر متمانەی لەسەر هەبوو. رۆژگارێ هات لەنزیکەوە بەو ئاشنا بووم، زۆر رێك‌و پێك‌و بەرێز بوو، من

زۆرم دڵ چووە سەری، لەهەمان کاتدا هەستم کرد ئەویش دڵی کەوتۆتە سەرم.

دوای ئەوە کارەکان بەڕێگایەکی سەیر دەڕۆیشتن، دوایی بۆم دەرکەوت ئەوە ئەو کەسەیە ڕۆژێ لەڕۆژان سۆراغم کردووەو دوای ئەو هەموو ساڵانە هاتۆتەوە بۆچی ئێستا کەوتۆتە بەر چەنگانم؟

ڕۆژ بەڕۆژ ئەم پیاوەم لەبەر چاوان بەرزتر دەبۆوەو مێردەکەم لەبەر چاو ڕەشتر دەبوو، وەکو بڵێی پێویستیم بە ئەوە جوانی کەسایەتی ئەو ببینم تا دزێوی کەسایەتی مێردم بدۆزمەوە.

کاروباری نێوان منو ئەو کەسایەتیە بەڕێزە لەو داڵغانە تێ پەڕی نەکرد کە شەوو ڕۆژ بەرۆکی گرتبوم. نە ئەو ناو دڵی خۆی بۆمن باس دەکردو، نە من ناو دڵی خۆم بۆ ئەودەخوێندەوە، لەگەڵ ئەوەشدا ژیان لەلای من هەرەسی هێناو، مێردەکەم بەلاوە تەنیا کەسێکی لاوازو دۆڕاوو سەلبی یەو حەزم بە چارەی نەدەکرد. نەم دەزانی بۆ هەندە رقم لێ داگرتبوو، دەمپرسی چۆن ئەوەندە ساڵە بەرگەی ئەو گرانیەم گرتووەو، من بەتەنیا ملبەملانەی دەبەرێکرا چونەکانی ژیان دەکەم. تاڕادەیێ کارەکان لەجێگای خۆیان نەمان، کە داوای جیابونەوەی لێ بکەم، بەڵام لەسەر داوای من تەڵاقی دامو دوای من بووە پیاوەکی روخاو.

هــەموو ئەوانــەش لــەدوای وێــران بــوونی ماڵمــداو روخــانی منداڵەکانم‌و مێردم بەهۆی تەلاقدانم، لەروی خێزانیەوە بارودۆخی ئەم پیاوەش تێك چوو، ژنەکـەی چـونکە ژن بەخورسـکی زۆر هەسـتیارن هەستی کرد چی لەدڵی مێردەکـەی دا شـاراوەتەوەو ژیـانی ئەویـشی کرد بە دۆزەخ.

ئێرەیی ئەم ژنەی والیێ کرد شـەوێکی مـاڵ‌و حـاڵی خـۆی بـەجێ بێڵێ‌و کات ژمێری دووی بـەیانی بـدات بەسـەرمداو هـاوار بکـات‌و بگرییێ‌و تۆمەتبارم بکات، کە خەریکە خێزانی ئەویش دەڕمێت.

دان بەوە دادێنم کە ئەم دانیشتنانە جوانانەمان کـە پێکـەوە تـێ یدادەژیان هەلی رەخساند یـەکتری بناسـین بـەلام تەمەنەکـە گونجـاو نەبوو.

خێزانی من‌و ئەویش ڕوخـاو هـەموو شـتێکم لەدەسـت دا، مـن دەزانم‌و هـەل‌و مـەرجی مـن‌و ئـەو ریگـا بـەوە نـادات کـە هـیچ هەنگاوەکی پۆزەتیڤ بگرینە بەر بۆ پەیوەندیمان بەیەکترییەوە، ئێستا لەهەموو کاتێ کلۆڵ‌و داماوترم‌و لەبەختـەوەری یـەکی ئەندێـشەیی‌و هیوایەکی لەدەست چو دەگەڕێم.

# چیرۆکی (٢٥)

## سەربەسەر (واحدە بواحدە)

(ام احمد) قسەمان لەگەڵدا دەکاتو دەڵێ: مێردەکەم کۆمەڵێ هاوڕێ ی هەبوون هەموویان ژنیان هەبوو، بە حوکمی ئەوەی پەیوەندیمان خۆش بوو هەفتانە لەماڵێکدا دادەنیشتین بۆ بەزمو ئاهەنگو شەونخونی.

خۆم لەکەشێکی نائارامدا دەژیام، شەوانە خواردنو شیرنەمەنیو چەرەزاتو شەربەت دەهاتو دەنگی پێکەنین دەنگی دەدایەوە، ئەمەش بەهۆی گێڕانەوەی نوکتەی ناشیرین، کە زۆر جار لەسنور ئەدەب دەچووە دەرەوە.

بەناو دۆستایەتی یەوە شەرم نەما، بەین بەینە پێکەنینی نهێنی لەنێوان فلان پیاوو فیسار ژنەدا ئەبیسترا، گاڵتەو سوحبەت زۆر جار سەری دەکێشا بۆ مەسەلە هەستیارەکان وەکو سێکسو شتی تری تایبەت بە ژنانو، مەسەلەکە زۆر ئاسایی بوو سەرنج راکێش بوو. هەرچەندە منیش لەو مەسەلانەوە گلابووم بەڵام ویژدانم سەرکۆنەی دەکردم، تا ئەو رۆژە هات کە پەردە لەسەر ئەم بەزمە بێ شەرمی یە هەڵماڵرا. دەنگی زەنگی تەلەفۆن هات گوێم لەدەنگی یەکێ لەو

دۆستانە بوو منیش بەخێر هاتنم کردو داوای لێ بوردنم لێ کرد چونکە مێردم لەماڵ نییە. بەڵام ئەو وەڵامی دایەوە من دەزانم من لەبەر چاوی تۆ ئەو پەیوەندییەم کردووە! دوای ئەوەی داوای کرد دەستی لەگەڵ تێکەڵاو بکەم وروژامو لێم توند کردو زۆر قسەی ناشیرینم پێ گوت. بە قاقاوە وتی: گەر راست دەکەی ئەو ئازایەتیە لەگەڵ مێردت بنوێنە، چاودێری بکە چی دەکات...ئەم قسە قەڵەمی دەستو پێی منی شکاند، بەڵام غیرەتم دانە خۆمو لەدڵی خۆمدا وتم: لەوانەیە ئەم پیاوە مەبەستی بێ ماڵی من وێران بکات. بەڵام توانی گومان لەراست مێردەمدا بۆ پەیدابکاتو دڵی لێ پیس بکەم. پاش ماوەیەکی کورت بەڵا گەورەکە سەری هەڵدا، دۆزیمەوە کە مێردم ناپاکیم لەگەڵ دەکاتو دەستی لەگەڵ ژنێکدا تێکەڵ کردووە. مەسەلەکە بۆ من ژیانو مردن بوو. روم لەمێردم کردو پێم وت: هەر تۆ بەتەنیا ناتوانی پەیوەندی پەیدابکەیت، منیش هەمان پرۆسەم پێشنیازکراوەو، ئەنجا بەسەر هاتی هاورێکەیم، بۆ گێرایەوە، ئەویش بۆ پلەی شلەقان سەرگەردان ما. پێم وت: گەر تۆ دەتەوێ بە پەیوەندی نێوان تۆو ئەو ژنە رازی بم ئەوە سەر بە سەرە. قسەکانی من لکەیەکی رەش بوو بەرویەوە گیانی ئەوی هەژاند، ئەو دەیزانی من مەبەستم ئەوە نییە، بەڵام هەستی بە کارەساتێ کرد، کە

دوچاری ژیانی ئێمە هاتووە، وە بەو ژیانە گەندەڵەی لەناویدا دەژیــن. زۆر سزام چێژا تا مێردم دەستی لەو داوین پیــسە کــردەوە، کــە دڵــی پێوە نوسا بوو. بەڵێ وازی لێ هێناو بۆ خێزان گەڕایــەوە، بــەڵام کــێ مێردم بۆ ناو دڵ دەگێڕێتــەوە؟ کــێ رێــزو شــکۆی جــارانی لەناخمــدا دەگێڕێتەوە؟ ئەم برینە گەورەیە لەدڵم دا بۆن سۆو پەشیمانی لــێ دێ دێتە دەر لەراست ئەو دۆخە بۆگەنە، تــا ســەر وەکــو شــاهید حــاڵێ دەمێنێتەوە بەسەر ئەو بەزمو شەونخونیە بێ تاوانانە، کە لەناوەڕۆکدا بێ تاوان نییەو داوای بەزەیی لەخوای سەربڵند دەکات.

# چیرۆکی (٢٦)

## بێچوەی مراوی مەلەوانە:

کچێکە (١٩) ساڵەو بەسەر هاتی خۆیمان بۆ دەگێڕێتەوە: من کچەکی بچکۆلانە بووم بە دووچاوە بێ تاوانەکانم سەیری ئەو بەزمو شەونخونیانەم دەکرد، کە دۆستانی خێزانی لەناوی دا مۆڵگەیان دەبەست. من لەیادمە تەنیا یەك پیاوم لەناو ئەواندا دەبینی، ئەویش باوکم بوو، من سەیری هەموو جوڵەو هەڵس و کەوت و هەڵسان و دانیشتنەکی ئەوم دەکرد، سەیری تەماشاکردنەکانی ئەوم دەکرد کە خەریك دەبوو ئەو ژنانە قاچ و سنگیان و بەرۆکیان هەڵبلوشێ، بەچاوی فلانەو قژی فیسارەو بەژنی ئەوەکەی تریان خۆشەویستی دەردەبڕی. دایکە قوربەسەرەکەم ناچار بوو ئەو جۆرە میوانداریانە سازبکات، ئەو خانمەکی زۆر سادە بوو. لەناو ئەو ژنانەدا ژنێك هەبوو زۆر سەرنجی باوکمی رادەکێشا جارێ بە نزیك بونەوەو جارەکی تر بە هەڵس و کەوتە مێ بینەکانی، هەرچی من بووم زۆر بە گرنگی یەوە سەرەنجی باوکم دەدا، دایکیشم لەچێشتخانە سەرقاڵی میوانداری بوو. لەهیکرا ئەم کۆبونەوانە پچڕان، بەم تەمەنە بچوکەم لەهۆیەکانی دەگەڕام، بەڵام نەمتوانی سەریکەوم.

ئەوەی من لەیادم نەچۆتەوە ئەوەیە دایکم لەوکاتەدا بەتەواوی ڕمابو تاقەتی ئەوەی نەمابوو گوێ بۆ بیستنی ناوی باوکم بگرێ لەماڵەوەدا. لەماڵەوە گوێم لەهەندێ وشەی شاراوە دەبوو، کە

گەورەکان لەدەورمدا دەیانچرپاند وەکو: (ناپاکی، ژوری نوستن، بەچاوی خۆم بینین، ئەو بەدڕەوشتە، لەبارەکی بێ ئابڕویی دابوو...) کە تەنیا گەورەکان لەو وشە سەرەتاییانە تێ دەگەن.

گەورە بوومو حاڵی بوومو لەهەموو پیاوانم قین دا گرت، هەموویان ناپاکی دەکەن، دایکم ژنەکی تێ شکاو بوو، هەر ژنەکی دەهاتە ماڵمان دڵی لێ پیس دەکردو بە پیاو فریودەر ناوی دەبرد، گوایە باوکم لەخشتە دەباتو، هەر خەریکی هیوایەتی باشی خۆیەتی، ئەو ژنانی راودەنان، بەڵام لەدەرەوەی ماڵدا نەك لەناوەوەی ماڵدا.

تەمەنی ئێستام (١٩) ساڵە، بەڵام زۆر لەلاوان دەناسم، کاتێ تۆڵەیان لێ دەسەنمەوە هەست بە چێژەکی زۆر دەکەم، ئەوانە فۆتۆکۆپی باوکمن، من هەمیشە فریویان دەدەم، بێ ئەوەی دەست لەتاڵە موویکم بدەن، ناتوانن جوڵەو لەنجەو ئاماژە بە مەبەستەکانم لەناو خەڵكو بازاڕەکاندا دەستیان پێم ناگات، قەت مۆبایلم بێ دەنگ نابێ، هەندێ جار هەست بە شانازی بەو کارانەوە دەکەم کە تۆڵە بۆ رەگەزی مێ بینە دەکەمەوە، هەندێ جاریش هەست بە بەدبەختیو دۆڕان دەکەم تا ئاستی خنکان، ژیانی من هەورەکی گەورەی رەش دایگرتووە، کە ناوی باوکمیان پێوەیە.

## چیرۆکی (٢٧)

## بەر لەوەی تەوراس(٢) بە سەری بکەوێت

کچێك ئەزموونی خۆی دەگێڕێتەوەو دەڵێ:

رۆژێ لەرۆژان بیرم لەوە نەدەکردەوە، کە بارودۆخی کارەکەم ناچارم بکات تێکەڵ بەپیاوان ببم، ئەمەش بەراستی بەسەرم هات، سەرەتا خۆم لەراست پیاواندا دەمامکم بەکاردەهێنا، بەڵام هەندێ لەدۆستانم وتیان ئەم بەرگە زیاتر سەرنج بەرەو لای من رادەکێشێ، بۆیە باشترە دەمامك یان سەرپۆش لابدەم، بەتایبەتی چاوەکانم، کە هەندێ ئەدگاری تایبەتی یان پێوە دیاربوو.

لەبەر ئەوە هەڵسام دەمامکم لەسەر چاوم لادا، چونکە پێم وابوو ئەمە چاکترە. لەگەڵ تێکەوڵاوبوونم لەگەڵ هاورێیانم دا بینیم من لەناویاندا دەگمەنو ناوێزە هەڵکەوتووم، وشکمو قسە لەگەڵ کەس ناکەمو روم نادەمە کەس، هەموویان لەم ژنە دورە پەرێزە خۆیان لادەدا، یەکێ لەوانە لەروی دام، کە حەزناکات مامەڵە لەگەڵ کەسێکی لەخۆیایی وا مامەڵە بکات، هەرچەندە بە پێچەوانەوە

---

(2) (الفأس): تەوراس، تەوداس، بیور.

هەرگیز من وانەبوو، بۆیە بڕیارم دا ستەم لەخۆم نەکەمو نەیخەمە نـاو بازنەیـەکی قێزەوەنـەوە لەگـەڵ هاوڕێکانـدا، بۆیـە دەسـتم کـرد بەکردنەوەی دەرگای گفتوگۆ لەگەڵیاندا، تا هـەموان گەیـشتنە ئـەم بڕوایە من توانای قسەکردنو کار تێ کردنم هەیە، هەمیسان بە ورەوە دەدوێم، هەروەها لای هەندێ برادەر جێگای سـەرنج بـوو، تـا بینـیم کارم کردە بەرپرسەکەمانو جوڵەو شێوازی قسەکانی من دەیـشێواندو زەردی دەکرد. هەندێ جار خۆی بابەتێکی دەوروژاند تـا مـنی تێـدا بخاتە دەنگو لەسەیرکردنەکانی بوغزو زەرد هەڵگەڕان تێبینی بکەم، من نکۆڵی لەوە ناکەم ئەو پیاوە هەندێ بیرکردنەوەی بۆ پەیداکردبوو، هەرچەندە بیرکردنەوەی من واقـی لـەوە وڕمـابوو چـۆن ئەوەنـدە بـە ئاسانی پیاو دەکەوێتە داوی ژنەکی پابەندەوە، چ جای ژنـەکی روتو خۆی داوای خراپەکاری لێ بکات؟ بەراستی قەت بە رێگای ناشەرعی بـیرم لـێ نـەدەکردەوە، بـەڵام سـەرەتاو کۆتـایی تـا ماوەیـەکی زۆر روبەرێکی لەبیری من داگیرکـرد، بـەڵام سـەربڵندیو روسـوری خـۆم رێگای بەمەنەدا ببمە ئافرەتێ بۆ دەست گـەرم کردنـەوەو چـێژەکانی ئەو پیاوە نامۆیە، تا بۆ چێژەکی مەعنەویش، بۆیە هەڵسام بەتەواوی هەموئەو رێگایانەم پچڕاندن، کە ناچارم دەکەن لەگەڵی دا دابنیـشم بە تەنیایی. لەکۆتایی دا بەم ئاکامانە گەیشتم:

(١): ســەرنج راکێــشانی نێــوان ژنو پیــاو لەهــەمو شــێوازەکی تێکەڵاوی دا پەیدادەبێ، هەرچەندە پیاوو ژنەکە نکـۆڵی لـێ بکـەن، بە مەشروعی دەست پێ دەکاتو بە ناشەرعی کۆتایی دێت.

(٢): تا ئەگەر خۆشت داوێن پاك رابگری لەداوەکانی شەیتان دور نابیت.

(٣): کاتێ مـرۆڤ زامـنی خـۆی بـوو بـە سـنورەکی رێـتێ چـوو مامەڵـەی لەگـەڵ مرۆڤـدا کـرد نـاتوانێ زامـنی هەسـتی کەسـی بەرامبەری بکات.

(٤): دواجار تێکەڵاوی سـودی تێدانییـە، بەرهـەمی چـاکی لـێ ناکەوێتەوە، بەڵکو هزری ساغو بیرکردنەوەی دروست لەکار دەخات.

## چیرۆکی (٢٨)

## کوا غیرەتو پیاوەتی!

کاتێ خۆم لەبازاڕ بوو بۆ کڕینی هەندێ کەلو پەل هەلوێستەکم بۆ پەیدا بو، چومە جێگایەکی ئارایشو ئیکسسیوارەکان، براکەم کە یانزە ساڵانە بوویاوەرم بوو دیمەنێکی سەیرم بینی، لەو دوکانەدا ژنو مێردێو دوکاندارەکە وەستابوو، ژنەکە لەهەندێ دەرمانی جوانکاری دەگەڕا، کە لەگەڵ وێنەی دەمو چاوو پێستی ئەودا بسازێ، کاتێ خاوەن دوکانەکە زانی لەشتەکی دەگەڕێ نایدۆزێتەوە، پێی وت: ڕەنگی دەمو چاوت چۆنە؟ وتی: ڕەنگەکەی ئاوایە. خاوەن دوکانەکە وتی: پێستی دەمو چاوت کتو مت چۆنە تا ڕەنگی ماکیاجەکەت لەوە بدەمێ. مێردەکەش ڕەق وەستابو، خۆزگە هەر ئاوا دەمایەوەو وتی بە ژنەکەی: بۆ دەمو چاوت ناکەیەوە، لەکاتی پێویستی دا قەیدی چییە، تا جۆری ڕەنگەکەت بزانێت!! کاتی زۆرمان لەدەست چوو ئێمە دەمانەویست بزانین چی گەرەکە، لەو کاتەدا ژنەکە ویستی دەمامکە لابدات(٣).

---

([3]) دیارە لەمەزهەبی شافعیو وتەیەکی ئەحمەددا سەیرکردنی دەمو چاوو دەستی ئافرەت گەر بەمەبەستی شەهوەت نەبێ گوناه نییە، دیسان دەمو چاوو دەست شەرمگە نییە. قورئان دەفەرموێ: ﴿وَلَا يُبْدِينَ زِينَتَهُنَّ إِلَّا مَا

لەو کاتەدا بەخۆم نەوەستام‌و پێم وت لـەخوا بترسـە چـۆن لەبـەر قتوە سورو سپیاویێ دەم‌و چـاوی ژنەکـەت بـەدەرەوە دەخـەیت؟ کـوا مەردایەتیت؟

ژنەکەم هەندێ دورخستەوەو پێم وت: دەتوانی لیـستی رەنگـەکان لەخاوەن ئارایشگەکە وەربگری‌و بیبەیە ماڵەوە لەژنـەکی بپرسـە کـە شـارەزابێ لـەو بـوارەدا، ئـەویش سوپاسـی کـردم‌و چـووم لیـستی رەنگەکانم بۆ هێنا، بەر لەوەی خۆی‌و خێزانـی بـڕۆن لـەو جێگایـەدا مێردەکەی بە منی وت: ئەی کچی روسپی خوا پاداشتت بداتەوە.

---

ظَهَرَ مِنْهَا﴾ (النور:٣١.) (القرطبي) لە(تفسیر القرطبي)دا دەڵێ: (مەبەست لەدەم‌و چاوو دەستە، کە شەرمگە نین، وەکو فەرمودەی پێغەمبەر (ﷺ) لەراست (اسماء )دا ئەوە دەردەخات. (یا اسماء اذا ان المرأة اذا بلغت المحیض لم یصلح ان یری منها الا هذا/ واشارالی وجهه وکفیه ). واتە: گەر کچ گەیشتە حەیزو مەهك نابێ لەدەم‌و چاوو دەستی زیاتر بەدەرەوەبێت، بەڵام لەمەزهەبی مالیکی دا هەموولەشی ئافرەت شەرمگەیە هەتا نینۆکەکانیشی نابێ بەدەرەوە بن. لەهەندێ وڵاتانی ئیسلامی دا حوکم بەو قسەی مالیکی دەکرێت‌و ژنەکان دەم‌و چاویشیان دەمامکی لەسەرە، کە بە(نیقاب) ناسراوە. بەڵام رێرەوی شافیعی لێرەدا راستی پێکاوەو سونننەتیە.

## چیرۆکی (٢٩)

## تەنیا لەبەر ئەوەی ژنەکەی لەبەر چاوی پیاو بپارێزێت:

لەسەردەمی یەکێ لەپادشایانی عەبباسی دا بە ناوی (معتضد) ژنێ بۆ لای یەکێ لەقازیەکان دەڕوات، سکاڵا لەمێردی ئەکات، کە (٥٠٠) دینار لەمارەیی یەکەی بداتێ، پیاوەکەش نکۆڵی لەوە دەکات، ئەویش دەڕوات شاهید بۆ خۆی بێنێت، لەدادگادا وتیان دەمانەوێ روی ژنەکە ببینین ئایا ئەم ژنەیە یان نەء، کاتێ لەسەر ئەوە سوربون دەمامکی لابدات، مێردەکە وتی: نا دەمامکی لامەدەن ژنەکەم راست دەکات، ئەم پیاوە بۆیە دانی بەمەدا تا پیاوان روی ژنەکەی نەبینن، ژنەکەش، کەزانی لەبەر ئەوە مێردی دانی بەمەداناوە تا پیاوان روی نەبینن وتی: مێردم لەدنیاو قیامەتدا گەردنی ئازاد بێت.

# چیرۆکی (٣٠)

## خۆت لەمۆبایل بپارێزە

ئەم بەسەرهاتە بەر لەچەند رۆژێ لەکچێکم بیستووە، کە بەهۆی خراپ بەکارهێنانی مۆبایل ژیانی لەدەست داوە، ئەم روداوە مشتێکە لەخەروارێك، چیرۆکێکە لەهەزاران چیرۆکی راستەقینە، کە هەموو رۆژێ دوبارە دەبنەوە، ئەم بەستەزمانە دەڵێ:

ئەم گەنجەم لەرێگای مۆبایلەوە ناسی، پەیوەندی پێوە کردمو لەراست ماڵی فیسار کەس لێی پرسیم؟ پێم وت: ژمارەکەت هەڵەیە، من قسەی نەرمو شیرینم لەگەڵدا کرد...وریابن بزانن قسەی نەرمی ژنان چەند کار لەدڵی پیاوان دەکات.

ئەنجا جاری دووەمو سێ یەمو چوارەم زەنگی بۆ لێدامەوە... پەیوەندیم لەگەڵی دا خۆشتر بوو، وەك بڵێ ی دەساڵە ناسیومە، ئەمەش تەنیا وەسوەسەو ئیحای شەیتانی نەفرین لێ کراو بوو، ئەو بە منی وت لەیەکەم ساتەوە بە پاکی خۆشم ویستوویت، هەموو ئەوەش بەر لەوەی چاوی بە من کەوتبێت.

ئەم بەستەزمانە بەم قسە لوسو شیرینانە فریو دەخواتو شەیتان لەخشتەی دەبات، خوا راستی فەرمووە: ﴿فَلَا تَخْضَعْنَ بِالْقَوْلِ

﴿فَيَطْمَعَ الَّذِي فِي قَلْبِهِ مَرَضٌ وَقُلْنَ قَوْلاً مَّعْرُوفاً﴾ (الأحزاب: ٣٢).
واتە: قسەکانتان بە نەرمی مەکەن لەگەڵ پیاواندا، نەوەکو ئەو کەسەی دڵ نەخۆشە تەماعتان تێ بکات‌و قسەی باش بکەن (لەکاتی ئاخاوتنتان دا).

دەڵێ: لەرێگای مۆبایل‌و نامەکانمانەوە چەند جارێ چاو پێ کەوتنمان کردو بەڵێنمان گۆڕینەوە، ئەو چاوپێ کەوتنانە نهێنی بوون، خزمانم پێیان نەدەزانی، من درۆم لەگەڵیاندا دەکردو دەمگوت من دەچمە لای دەستە خوشکەکەم، کە کچێکی رێك‌و باشەو زۆرم خۆش دەوێ، پاشان دەچومە دیداری ئەو، گەر دەمبینی سۆزو خۆشەویستی‌و پاکی بۆ من دەردەخست‌و وای پیشاندەدا یەك سات ناتوانێ لێم دوربکەوێتەوەو ژیانی بەبێ من وەکو دۆزەخێکە، هەندێ وێنەی خۆمی لێم وەرگرت‌و لەگەڵ مندا وێنەی گرت. دوای چوار ساڵ تەمەن داوای داوێن پیسی لێم کرد، وتی: گوێ مەدەیە ئەم کارە ئیمڕۆ بێ یان سبەی قەیدی نییە، من‌و تۆ هەر هاوسەرگیری دەکەین. من لەم قسانە رامام‌و کەوتمە بیرکەوتنەوە، هەستم بە ترسەکی زۆر کرد، چی بکەم، هاندەرەکانی بڕوا لەدڵمدا جولان، کە چەند ساڵێ بوو لێ یان بێ ئاگا بووم، ویژدانی لەمێژینەی مردوم کەوتە جوڵەو بێدار بۆوە، بەلام کاتێ وەختی بەسەر چووەو لەمێژە لەبێ ئاگایی دابووە.

لەخۆم پرسی: کوا هاوسەرگیری؟ کوا دینو خزمو ناموسو ئـاگرو خەڵكو شەرەفو کچێنی، ئەمەیان بێ شەرمیو بێ ئابڕوییە.

وتم: تا نەچینە ناو ژیانی هاوسەری یەوە شـتی وا ڕونـادات، کـە خۆت بەڵێنت داوە.

وتی: بەستە زمان، گەر خۆت بەدەستەوە نەدەیت، لای خزمانـتو خەڵکی ئابڕوت دەبەم، من بەڵگەم لەدژی تۆ هەیە، ئـەوەتا وێنـەتو قسەکانت هەمووی لای من تۆمارکراوەو نهێنیو تۆو خێزانتم لایە.

ئەم کچە بەستەزمانە دوای ئەو هەموو ئارام گرتنەی ناچـار کـرد بۆ ئەم کارە خراپەو بە ناموس شکاویو دەست بەتاڵی گەڕایەوە، کوا هاوسەرگیریو شەوی زاواییو مارەیی، تەنیا خەمو دەست خـەرۆییو ئابڕوچونی تا سەر بۆ مایەوە. چی بـە خێزانـیو براکـانی بڵـێ، کـە متمانـەیان داوەتـێ، چـۆن ئـەم تەمەنـەیان لەگەڵـدا بەسـەر بەرێ...دەیوت: خوایە هەموو ئەو لکەداری یە لەبەر یەك قسە بـوو، کە بەسەر خۆم هێنا.

# چیرۆکی (٣١)

## ژیانی ئابڕوچونو ڕابواردن:

کـچێك لەیـەکێ لـە دەوڵەتـە عـەرەبەکانـەوە(٢٥) سـاڵەیە لـە لەزانکۆیەکی عـەرەبیدا دەخوێنیو چوارساڵە توشی ئایدز بووە دەڵـێ: هەموو ئەو قوربەسەریەم بەهۆی ژیانی بێ ئابڕوییو ڕابـواردن توشـی هات، گوناهی منی تێدا نەبوو، بـەڵکو گونـاهی بـاوکم بـوو، قـەت ئـاوڕی لـە مـن نەدایـەوە، بەتایبـەتی دوای مردنـی دایکـمو ژن هێنانەوەی. ڕۆژێك لەمنی نەپرسیەوە بـۆ کـوێ دەچـی؟ هاوڕێیانـت کێن؟ چـۆن کاتـت بەسـەردەبەیت؟ زۆر لێ ی پاڕامـەوە بایـەخم پـێ بدات، بڕوام پێ بکەن هێشتا نازانی لەکام ئاستەی خوێندندام، نازانێ کە کچێکی هەیە.لاوێکم ناسی،بەڵکو زیـاتریش لەگـەڵیان دەچـومە دەرو پیاسەم دەکرد گەر ڕوپـا مـاییش بـێ گرنگـی یـان پـێم دەدا، هەموو شتەکی نارەوام کـردو مـاددەی هۆشـبەرم خـواردو ڕۆیـشتم، هەموو ناوچەکانی ئەو ولاتەی لەناوی دا دەژیاین لەگەڵیانـدا گـەڕام، هەتا توشی ئایدز بوومو، کاتێ هەستم بـەوە کـرد، کـەدوای ئـەوەی پشکنینی پزیشکیم بۆ کرا لە نەخۆشخانەدا، پاش ئەوەی هەستم کرد بـە مانـدوییو لاوازیو داهیزرانـی گـشتی، تـا ئێـستا بـاوکم بـە

نەخۆشیەکەم نازانێت، تەنیا مانگانە سەرێکمان لێ دەدات بۆ خـەرج کێشانمان.

زۆر حەزدەکەم بمرمو لەکۆڵ ببمـەوە، بـەڵام دەترسـم خوشکانیـشم چارەنوسیان بە چارەنوسی من بێت. خەمو پەژارەم بۆ لای خوای خـۆم بەرزدەکەمەوە.

## چیرۆکی (٣٢)
## ئافرەتێکی سەرگەردان

من کچێکم حەز بە قەیدوبەنـدو فەرمانـەکان ناکـەم، دڵـم بـەوە تەنگ دەبوو، کە خێزانم ئەو شێوازەی لەگەڵمدا بەکاردەهێناو منیـان خستبۆ ژێر چاودێرییەوە، مـن ژیانـەکی پـڕ لەسـەرە ڕۆیـیو نکـاوو تراژیدیاو خەمەکانم بردە سەر، هەندێ جـار بـیر لـە خۆکوشـتنو خـۆ رزگارکردن دەکەم لە خەمەکانی دنیا. لەسەرەتای قۆنـاغی زانکـۆیی دا دەستم کرد بەبڕینی بەربەسـتی ئاسایـشیو ئـەمنی، کـە خێـزانم لەسەروبەری پێ گەیشتنو هەرزەکاری دا خستبویانە سەرم، هەنگاوی یەکەم لە گرتنی هەندێ هاوڕێ بوو لە زانکۆدا بە وەرگرتنی ژمـارەی مۆبایلو تەلەفۆنەکان. ئەم قۆناغە زیاتر لە هەموو شتێ بەڕێ کردنی کـاتو ڕابـواردن بـوو. دوای ئـەوە لەسـەر ئـەوە ڕاهـاتم گاڵتـە بـە هەڵوێستی لاوان بکەمو بەربەسـتی چـاودێری خانـەوادە بـشکێنمو، حەزم لە پێشکەوتنی زیـاتر لەمـەش دەکـرد، ئـەوەش دژوار نـەبوو، سەرەتا پرسیارم لە هەندێ لە دەستە خوشکەکانم کرد، ئەوان هەنـدێ ڕێگای بێ ترسیان ڕێنوێنی کردم ...یەکـەم جـار لـەڕێگای کارگـەی

ژنانەوە بوو، کەژنەکی پسپۆڕ سەرپەرشتی دەکردو هەموو جۆرە دیدارەکانی تاکیو ئاهەنگی بەکۆمەڵی ڕێك دەخست.

ئەم ئەزموونە وروژێنەربوو لەگەڵ گیانی سەرەڕۆیی من دەسازا، بەڵام بێ باكو بێ دژواری نەبوو، چونکە من شتەکی گەورەم لە ژیانمدا وەکو مێ بینە لە دەست دابو، هەتا کچێنیەکەشم بەداخەوە، بەڵام زۆر لەو هەوایە نوێیە دور نەدەکەوتمەوە کە چومە ناوییەوە، خۆم هەستم بە سەرکەوتن دەکرد بەسەر ئەو کۆتەدا خێزانم توندوتۆڵی کردبوو بەسەرمەوە، بەرلەوەی هیچ بەڵگەیەکیان بەسەرەوە هەبێ: هەندێ جارلێم دەکەوتنە گومانەوە، بەڵام زۆرم لا گرنگ نەبوو. دوای ئەوەی توشی زۆر کلۆڵیو ئازار هاتم لەگەڵ ئەوانەدا کەوەکو شەمشەمە کوێرەیی یەی شەوانە بۆ هەموو جۆرە بەزمو ڕابواردنێ شەویان بەسەر دەبرد. من لە خۆشەویستو ئەویندارەکی ڕاستەقینەوە پاش سەردەمێ بوومە پێلاوێ، بارم خراپ بوو تا دنیا لەبەر چاوم ڕەش بوو، خزمانیشم هەستیان بەوە کرد. دایکم بردمیە لای شێخو دوعاگۆیێ قورئانی بەسەرداخوێندمەوە منیش گریامو قورئان کاری تێم کردو وام لێ هات بەڕێکی نوێژان بکەم، بەڵام زۆری نەبرد خەمەکانی خۆم بە نامەیەك بۆ یەکێ لە گۆڤارەکان ڕەوانەکرد. نامەکەم دەکەوێتە ژێردەستی سەرنوسەرەکەوە، ئەویش هەوڵی دا

بمناسیّ، کـاتیّ ئاشـنای یـەکتری بـووین بارەکـەم خراپتربـوو توشـی سەرەنگریّی تر بووم تا ئیّستا لیّ ی دەربازنەبووم: کچیّکی خزمم پیّ ی وتم: کە کچیّکی پابەند بوو، گۆڤـاری خیّـزان(الاسـرة) گرنگـی بـە کیّشەکانی دەرونی دەدات، بۆیە من نامەم بۆ نـاردوونو بەسـەرهاتی خۆم بۆ نوسیونەوە، وە من ئیّستا لە شوم ترین ڕۆژانی ژیانمدام.

## چیرۆکی (٣٣)

## من پەشیمانم

من کچێکی (٢٣) ساڵم، بە بارێکی دەرونی زۆر خراپدا ڕەت دەبم، هۆیەکەشی هەڵسوکەوتی هەڵەشە کەمتەرخەمی منە، من دان بەو هەلانەم دا دێنم و کەوتومەتە ناو دەریای پەشیمانی یەوە. دایکم مردو بۆ پڕکردنەوەی بۆشایی سۆزی‌و دەرونیم پەنام بردە بەر ئەنتەرنێت، خۆم سەرقاڵ دەکرد تا لەو خەم‌و پەستی یەی خۆم بدزمەوە، کە مردنی دایکم بەجێ ی هێشتبوو. لەو ڕێگایەوە گەنجێکم هەر لەشاری خۆمدا ناسی‌و چەند کاتژمێرێ ئاخاوتنم لەگەڵدا کرد، زۆری نەبرد گەنجەکی ترم ناسی کە هاوسنوری شاری خۆم بو. وە زۆر گەنج‌و لاوی تری کوڕو کچم ناسی. لەگەڵ ئەو گەنجەی دوایی دا، کە هاوسنوری شاری من بوو مشت‌و مڕمان پتر بوو، پاشان داوای ژمارەی تەلەفۆنی لەمن کرد، منیش نەمدایە، دوای پێداگرتنی ژمارەی مۆبایلەکەم دایە، وای لێهات پەیوەندی زۆرم پێوە بکات. دوای ئەوە داوای ژوانی لێکردم، منیش پەسەندم نەکرد، دوای سور بوونی قایلی کردم کە لە شوێنە گشتییەکان چاومان بەیەکتری بکەوێ‌و ئەو دیدارانەمان فرە بوون. لەو سەرو

بەینەدا گەنجێکی زۆر جوانم ناسی، کە شارەزاییی زۆری لە جێگاکـانی ئەنتـەرنێت هـەبوو بازاڕەکـانی دەزانـین، ئـەوەی نەمـدەزانی لێ ی فێربوم، گفتوگۆو دەمەقاڵیمان زۆر بو داوای ژمـارەی مۆبایلەکـەمی لێ کردم. دوای دوودڵی پێم دا، پاشان داوای دیداری کردمو دیداریشم کردو هەمو شتێك لەنێوانمان دا ڕویدا. ئێستاش سەرم لێ تێك چـووە نازانم چی بکەم؟ بڕوا بکەن نازانم پاشان گەنجی سێ یەمم ناسی کە لە هەموویان نەرمو جوان تربوو، هەستم بەخۆشەویستی کـرد لەگەڵیـدا، دوو گەنجەکانی ترم لا وەکو برا لێ هـاتبوو، گـوێم لـە هەواڵـەکانیان دەگـرتو بـەژداری چـارەکردنی کێـشەکانیانم دەکـرد، بـەم شـێوەیە پەیوەندیم بە سێیانەوە مایەوە تا خوشکەکەم پـێ ی زانـی. ئـەویش ئامۆژگاری کردم، منیش پەیمانم دایە کە وازیان لێ دێنم، تـا بـەردی لەسەر دابنێت.

زۆری نەبرد لاوێ هاتە داخوازیم، زۆر کوڕی چـاك بـوو، زۆر دڵـم خۆش بو چونکە لە کۆڵ کێشەکان دەبومەوەو لـە دەسـت ئەنتـەرنێت قوتارم دەبوو. خوازبێنیەکەم تەواو بوو داوام لـەو سـێ گەنجانـە کـرد کۆڵم لێ بدەن، دوانیان رازی بوون یەکەکەی تریان رازی نـەبوو، بۆیـە وەکو نەریتی ئەوانەی کۆمپیتەر بەکاردێنن کەوتـە دانـانی سـیخوری بەسەر پۆسـتەی ئەلیکترۆنیمـدا، دوو نامـەی منـی بـۆ دوو کـەسو

نامەی ئەوانی بۆمن دەست کەوتبوو چاپی کردبـوونو بـە ناونیـشانی ماڵی من ناردبونی، کاتێ بەرچاوم کەوتن خەریك لـە حـەیفان شـەق ببەم، بەپەلە چووم سوتاندنم نەوەکو بکەونە بەر دەسـتی مێردەکـەم، ئەمنی خۆشدەویو منیش ئەوم خۆشدەوی، بەڵام لەوە دەترسم پـێ ی بزانیو نهێنیەکەم ئاشکرا بێ وازم لێ بێنێت، هەست بـە گوناهـەکی گەورە دەکەم لە راستی دا.

هەر لەزەنگی ماڵ یان مۆبایل یان نامەی تایبەتیم بۆ دێ هەسـت بەترس دەکەم، یان هەر کە ماڵەوەمان سەرە باسێك دەکەنـەوە تـۆقم دەچـێو وا دەزانم بـە پەیوەنـدی هەڵەشـەی منیـان زانیـوە، مـن زۆرماندوم، خۆزگە مردبـام، مـن مامۆسـتام بـەڵام هەسـت دەکـەم شایانی ئەم کارە پیرۆزە نیم. شایان نیم خێزانم متمانـەم پـێ بکـەن. من پەشیمانم، پەشیمان.. تکایە نامەکەم بڵاو بکەنەوە تـا ببـێ بـە پەندێ بۆ هەموو ئەو کچانەی گەمەو ڕابواردن بە کۆمپیۆتەر دەکەنو دەکەونە ناو بۆسەوە.

## چیرۆکی (٣٤)

## کرداری مندالّ لەباربردنم هەڵبژاردووە یان خۆکوشتن!

من کچێکم تەمەنم(٢٠)ساڵانەیە، لەزانکۆدا دەخوێنم، دەستە خوشکەکم هەیە لە هەموانم لا بەرێزترە، بەلاّم یەك نەنگی هەیە، ئەویش خۆناساندنە بە گەنجان، لەگەڵیاندا پشوی خۆی دەدا، وە دەستە خوشکەکی بە ئەمەکەو لەکاتی ناخۆشی دا شان بە شانی من دەوەستێت. ئەوەی گرنگ بێ ئەو هەوڵ دەدات لاوێکم پێ بناسێنێ، بەلاّم من رازی نابم، چونکە حەز بەم رێگایە ناکەم، هەمیشە پێ ی دەلێم ئەمە رێگایەکە رۆژێدا تێ ی پەشیمان ببیەوە. لێتان ناشارمەوە دلّم فریوی دام، کە دەبێ رۆژێ بەم ئەزمونەدا بڕۆم، گەر بۆ جارێکیش بێت!

هەمیشە هەوڵی لەگەڵمدا تا توشی کردمو دیدارەکی بەبێ ئاگایی من سازدا ئەو کورە سەلامی کردو منیش بەرێزەوە وەلاّمم دایەوە.

لەگەڵ ئەو دیدارە خێرایەدا ژمارەی مۆبایلی خۆشی دامێ، منیش ژمارەی مۆبایلی خۆم دایە، دووەم رۆژ مۆبایلی بۆکردمەوە، سەرەتا لە کردنەوەی هێلّ لەگەڵی دا دڕدۆنگ لام، بەلاّم بەرێزەوە دواو لەراست شتەکی خوێندن پرسیاری کردو، پاشان وتی: لەزانکۆدا بەیەك دەگەین. دوای ماوەیێ پەیوەندیمان خۆش بوو، هەستم کرد ئەمە پەیوەندییەکە خۆشم دەوێو شتەکی تازەیە لەژیانداو خەمم لێ

دەڕوێنێتەوە.گەنجەکە شکۆدارو جوان شیرین بوو لەگەڵ ڕۆژگاردا گیرۆدەی بووم. شەوانە بەدرەنگەوە ئاخاوتنمان دەکرد نامەوێ زۆری لەسەر بڕۆم داوای کرد لە شوققەکەیدا سەردانی بکەمو وتی بە هاوڕێکەت بڵێ ئەو شوێنەکەم نیشانت دەدات. ئەوە بوو واقیعەن چومەوە ئەوێو دەستە خوشکەکەم بە تەنیا بەجێ ی هێشتین. ئەو کوڕە هەر خۆی لەمن نزیك دەخستەوەو سۆزی نیشان دەداو هەستم دەکرد دەیەوێ ئارەزوی خۆی لە من بشکێنێتو بەس، لەساتەکی لاوازی دا ئارەزوی خۆی لەمن دامرکاندو هەموو ژیانی لەناو بردم، ئێستا من لێ ی دوگیان بووم. ئەنجا پشتگوێ ی خستوم دوای مانگێ زانکۆ دێتەوە، چی بکەمو خێزانم نازانن، تەنیا منو ئەو هاوڕێیەم دەزانین، کە سوێندی بۆ خواردم ئەم گەنجە تەنیا دەیەوێ دیدارم بکاو بمناسێت. ئەنجا پێشنیازی کردووە لە باری ببەمو پزیشکێ هەیە بەدزییەوە منداڵان لەباردەبات. چی بکەم خەریکە خۆم بکوژم یان منداڵەکە لەبار ببەم.. چارە چی یە؟ بیستومە زۆر کچ منداڵیان لەبار بردوە، ئەی پیاوانی دینی ڕزگارم بکەن، لە ژیانی خۆم جارەس بووم، هەروەها لەم نهێنی یە بەدڕەوشتی یەی هەموو ڕۆژێ دەمکوژێت[٤]!!

---

([4]) بێگومان ئەم روداوە تەنیا روداوێکە لەهەزاران روداونن کەلەئەنجامی تێکەڵاوی کچوکوڕەوە پەیدادەبێ، لەرێگای دەڵاڵو مۆبایلو ئەنتەرنێتو نامەو رێگای ترەوە وەکو هاوڕێی خراپ.

# چیرۆکی (٣٥)
## کەنیشکەی مەسینجەر

من کچێکم لەتافی لاوی دام، وەکو کچەکانی تر ئەنتەرنێت بەکاردێنم، رۆژێکیان کەسێکم لەمەسینجەردا زیادکرد لەلای خۆم دا، داهاتوو زۆرم خۆشویست، گەر ڕۆژێکی نەم دواندبایە دڵتەنگ دەبووم، ئێوە نازانن چەندە کەیفم پێی دەهات، هەمیشە داوای لێ دەکردم بە مۆبایل لەگەڵی دا قسە بکەم، بەڵام من بە توندی رەتم دەکردەوە، بە حوکمی ئەوەی جێگای متمانەی گشتی بووم، زۆر هەوڵی دا، بەڵام رازی نەبووم کە رۆژێ لەرۆژان پەیوەندیم لەگەڵ هیچ کەسێکدا هەبێ، هەتا بە مەسینجەریش.

نزیکەی مانگێ پەیوەندیمان بەردەوام بوو لای خوشکەکەم لەمەسینجەردا زیادم کردبوو، ئەو نەیدەزانی ئەو خوشکمە، رۆژێکیان لەمن پچڕاو زیاتر لەهەفتەیەك دەنگی لێ راگرتم. ماوەیەکی زۆر تورەبووم، کاتێ گەڕایەوە بڕوام نەدەکرد، چونکە گومانم وابوو ناگەڕێتەوەو لەوکاتەشدا سووربوم لێی بگەڕێم، بەڵام قسەیەکی وای کرد ئەوەی لەیاد کردم، بەڵکو زۆرتر پێوەی گیرۆدە بووم، لەکۆتایی قسەکاندا داوای لێ کردم بە تەلەفۆن قسەی لەگەڵدا

بکـەم، بـەڵام مـن ڕازی نـەبووم. دوایـی مەسـینجەرم کـردەوە کـە لەئارادابوو قسەی لەگەڵدا نەکردم. ناچاربووم مەسینجری تایبەت بـە خوشکەکەم بکەمەوە لەوێدا دەستی بـە قـسەکردو داوای کـرد خـۆی بناسێنێت. لەو ساتەدا هەستم بە ناپاکی کردو قسەکانم تـەواو کـرد، نەیزانی من کێم، پاشان لەمەسینجری تایبەتی خۆمدا قسەم لەگەڵدا کرد، نەیزانی ئەوە هەر منم قسەم لەگەڵدا کردووە.

# چیرۆکی (٣٦)

## وتووێژێکی نێوان باوكو كچێ لەخەوندا:

ئەمە ئاخاوتنێکە لەنێوان باوكێكو كچێكی مردوی لەخەوندا، كە ئەم كچەی بە ئازارێكەوە سەردەنێتەوەو فرمێسك بە چاوەكانی گورِ گورِ دێنەخوارەوە. باوكی لەخەونی دەیبینێتو قسەی لەگەڵدا دەكات بە باوكی دەڵێ:

كچ: (حسبی الله ونعم الوكیل)

باوك لەترسان هەڵدەلەرزی: كچم لەدەست كێ خۆت پەنا دەدەیت؟

كچ: باوكە دەتەوێ لەدەست كێ خۆم پەنا بدەم بە خودا؟

باوك: كچەم بڵێ لەكێ؟

كچ: باوكە چی بە سەردێنێت؟

باوك: تۆڵەی بۆت لێ دەكەمەوە؟

كچ: ئایا دوای بەسەرچونی كات تۆڵەی لێ وەردەگریت؟

باوك: بەڵێ، تۆڵەت بۆ دەكەمەوە، بەڵام كێیە؟

كچ: ئایا خۆی لێ پەنا بدەمو(حسبی الله...) لێ بكەم؟

باوك: توخوا بیڵێو خێرا پێم بێژە..

كچ: (حسبی الله ...) دەكەم..

پاشان زۆر تورە بوو دەموچاوی جوانی ناشیرینودزێو بوو، وای لەباوکی کرد ئارەقە بکاتو لەترسان هەڵبلەرزیت..

کچەکە وتی: (حسبی اللە علیك)بکەم. ئەی ئەو کەسەی گوێت پێ نەدامو ئەو راسپاردەیەت ناپاکی لەگەڵدا کرد، (حسبی اللە...) لەتۆ دەکەم کە گوێت پێ نەدام لەدنیای نەت پاراستمو وات لێ کردم ئەمەم بەسەر بێت.

باوك: ئێستا تۆ لەکوێی؟

کچ: دوای ئاخەکی درێژ من لەچاڵەکی ئاگردام.

باوك: کچم چیم بەسەر داهێنایت؟

کچ: لەمن دەپرسی؟ ئایا منو براکانت پشت گوێ نەخستبوو؟

باوك: نەخێر کچم ئەی هەموو پێویستییەکانم لەخواردنو بەرگو خۆش گوزەرانیم بۆ فەراهەم نەکردبوون؟

کچ: ئەمە هەموو شتێ نییە.

باوك: دوای ئەمەکچەکەم چی بکەم؟

کچ: لەزۆر شت دا بەرەڵات کردبووین!!

پاشان زۆر ناشیرین تر بوو وەك بڵێ ی دوکەڵێ لەچاوەکانی بەرزبێتەوە. تۆ بۆ نوێژی بەیانیان بێدارت نەکردینەوەو، گەر دەچووینە بازارِ بە تەنیا گوێت لێ نەبوو! لەفیلمە سێکسی یەکان کە

ڕەوشتی رماندین ڕێگات لێ نەگرتین، شەوانە بەدیار فیلمەکانەوە بــێ چـاودێری دادەنیـــشتین، بـــەدەنگی مۆســـیقاوە دەخـــەوتین کـــە رات هێنابووین، دەچووینە دوکانی تۆمارگایەکان کاسێتی وامــان دەکــڕی خاوەنەکــەی جنێــوی پــێ دەدایــن، ئێمــە بێــزار نــەدەبوین چــونکە لەتەلەفزیۆن‌وڤیدیۆوە ڕاهاتبوین، کە بە ئازادی بە پارەی خــۆت بــۆت کڕی بووین. لەهیکرا باوك لەخەونەکــە راســت بــۆوە، هەڵدەلــەرزی، هەرچەندە پەرۆشی چارەنوسی کــچەکەی بــوو، بــەلاّم حــەزی دەکــرد گفتوگۆکە تەواو بایە ئەنجا هەڵسابایە، چونکە بڕیــاری دا خــۆی لــەو هەلاّنە دوربگرێ‌و منداڵەکانی تری لێ رزگار بکات.

# چیرۆکی (٣٧)

## نەزۆك دەبێت:

گەنجێ بە گەشتو گوزار دەڕواتە هەندەرانو شـوققەیەکی ڕاخـراو بەکرێ دەگرێ، کچانێ شەوانە دەدەن بەسەری داو ئـەویش خـۆی بـۆ نـاگیرێ لـەو جەنگـەدا سـەرناکەوێو توشـی نەخۆشـی سـوزەنەك ( السیلان)و فەرەنگی(الزهری) دەبێـت. دوای چـەند سـاڵێ ژن دێـنێ، کاتێ ژنەکەی منداڵی نابێ دەڕواتە لای یەکێ لەپزیـشکانی نـەزۆکی شلەی تۆوی بۆ شیتەڵ دەکات، دەبینێ سـەرجەم زینـدەوەرانی تـۆوی ئەو مردون، چونکە نەخۆشیەکە لـەناوی بـردونو چـارەکردنیش تـازە بەسەر چووە. پزیشك پێی وت: ئەوە سزای خوایە لەدنیادا گـەر تۆبـە نەکەی سزای دوارۆژ توندتریشە.

## چیرۆکی (٣٨)

## شاهید بن من کچی خۆم لێ مارەبڕیوە:

ئەم بەسەرهاتە لە دیمەشقدا ڕوودەدات،کچێکی هەراش هەیە هەموو ڕۆژێ دەڕواتە زانکۆ بۆخوێندن‌و باوکیشی سەرۆکی لقێ دەبێ لەم زانکۆیەدا. ڕۆژێکیان ساردو سەرمایە، ئاسمان هەور دایپۆشیوە، ئێوارە بەسەرداهات بووە بروسکەو گرمە باران‌و تەزرەی قەبە دەباری، کە خەریك دەبوو سەری خەڵکی بشکێنێ، هەموو ڕایان دەکردە بەر هەر نسێیەك بۆ خۆ پەنادان.کچەکە لە زانکۆ هاتە دەرو ڕای دەکردو هەڵدەلەرزی‌و بۆ پەناگایەك دەگەڕا لەو گەردەلولە پەنای بدات، تەڕ بووەو نازانێ بۆ کوێ بڕوات‌و سەری خۆی هەڵبگرێت. تا دێ تەزرە زۆر دەبارێ لە دەرگایەکی خۆماڵی لە گەڕەکەکان دەدات، گەنجێ دەرگاکە دەکاتەوەو پێشوازی لێ دەکات تا گەردەلولەکە تەواو دەبێ‌و هەڵدەبرینگێنێ‌و هیچ کامیش ئەوی تر ناناسێت. تەنیا ئەوەندە نەبێ لە هەمان زانکۆدا دەخوێنێ‌و بەتەنیا دەژی‌و ژنی نەهێناوەو لەژورێك‌و سالۆنێکی دەرەکی‌و داپۆشراوو گەرماوەکی جیا لە ژورەکەدا ژیان بەڕێوە دەبات.گەنجەکە داوای لێ کرد لە ژورەکەدا پشو بدات تا گەردەلول‌و ڕەشەباکە خۆش دەکاتەوەو سۆبەی بۆ

دەبات‌و تا خۆی گەرم بکاتەوەو دوایی لای ببات. دوای ماوەیێ کچەکە لەسەر جێگاکەدا دانیشتووەو هەڵدەلەرزێ‌و خەو دەیباتەوەو خۆی بەسەر جێگاکەدا دەخات‌و درێژ دەبێت.گەنجە دەڕواتە ژور دەبینێ خەوتوەو وەکو پەری زادەیەکی بەهەشتەو سۆپەکە دەباتە دەر، بەڵام وەسوەسەی شەیتان دەڕواتە دڵیەوەو شێوەی ئەو کچە درێژبوەی ژورەکەی دەخاتە بەر چاو تا فریوی بدات.کچەکە بێدار دەبێتەوە دەبینێ لەسەر جێگا کەوتووەو نازانێ چی قەوماوە، بەرەو دەرگا ڕادەکات دەبینێ گەنجەکە لەبەر دەرگاکە کەوتوەو بوراوەتەوە.کچە دەڕوات‌و ئاوڕ ناداتەوە تا دەگاتەوە ماڵەوەو خۆی فڕێ دەداتە باوەشی باوکیەوە، کە هەموو ئەو شەوە سۆراغی کردووەو نەیدۆزیتەوە، هەموو بەسەر هاتەکەی بۆ گێڕایەوە، سوێندی خوارد نازانێ چی بەسەری داهاتوەو هەرچی ڕوی دابێ لەژێر ویستی ئەو دانەبووە. باوکەکە چووە زانکۆو سۆراغی ئەو گەنجانەی کرد ئەم ڕۆژە نەهاتوون، بینی یەکێ سەفەری کردوەو ئەوی تر لەنەخۆشخانە کەوتووە. باوکە کە چووە نەخۆشخانە تا تینوەتی خۆی بشکێنی‌و تۆڵەی لێ بکاتەوە، کەچی دەبینێ گەنجەکە لەوێ دەستی بە لەفاف بەستراوە. لە نۆژدار دەپرسێ چی بووە؟ نۆژدار وتی: هاتوە قامکەکانی سوتاوە. باوکەکە وتی: توخوا پێم بڵێ چی ڕوی داوە،

بەلام بێ ئەوەی بزانێ باوکی کچەکەیە، کە دوێنێ لای ئەو بووە.گەنجەکە وتی: دوێنێ کچێ پەنای بۆ هێنام لەدەست بارانو منیش لە ژوری خۆمدا حاواندمەوە، کاتێك چومە ژوورەوە بینیم پەری زادەیەك لە پەریزادەکانی بەهەشتو لەسەر جێگا خەوتووە، داوای لێ بوردنم لە خوا کردو سۆپەکەم بردەدەر. بەلام شەیتان هاتە دلمەوە وێنەی جوانی ئەوی خستمە بەرچاو فریوم بدات کە لەتەك منەوە لە ژورەکەدا کەوتووە.کاتێ خوام هاتە یادو ترسان لەزیناو شەیتان وەسوەسەی بۆ دەکردم. منیش چومە سەر ئەم سۆپە داگیرساوە قامکێکم خستە سەری تا سزای دۆزەخی بکەوێتەوە یاد، تاسوتاو لە سوێ ی ئازارەکە بورامەوە، نەمزانی تا خۆم لە نەخۆشخانە بینی یەوە. لەو کاتەدا باوکەکە هاواری کرد: شاهید بن کچی خۆم دایە ئەو کورە. بەلێ ئەمە بەرهەمێکی داوێن پاکی یە. کێ لەسەر حەرام سەبرو ئارام بگرێو بشتوانێ بیکات، خودا بەرهەمێکی حەلالی لەباتی ئەوە پێ دەبەخشێت.

# چیرۆکی (٣٩)

## بەسەرهاتی (ئیمان)

کچی خاڵم کە تەمەن (٢٠) ساڵانە بوو ئەو ڕەفتارە هێورەو ڕەوشتە جوانەی زۆر کاری کردبووە سەر دڵم، پاشان بەهۆی قسەی شیرین و ڕۆشنیری ڕەسەنی و شەرمی زۆری بەرەو وەرع و خۆپاراستن و ئاشتی دەبردم. لە ژیانەکی پڕ لە ئارەزو بازی دا ئەو کچێکی خۆپارێز بوو.

زۆر قسەڕون بوو کە لەڕەوشتەکەی سەرچاوەی دەگرت تا کەسانی تر تێ بگەیەنی. بۆیە ئیمان بووە قسەی سەرزاران و لەمیان کچانی خێزاندا نمونەی پێ دەهێنراوە، کە لەگەڵ ڕەوشتە بەرزەکەشی دا کە لەڕێگای کارە جوانەکانیەوە پیشانی دەدا، چونکە زۆر هۆگری قورئان بوو لە دەرخ کردن و خوێندن و پیادەکردنی دا، هەمان کات بە ژیریش ناوزە دەکرا. کاتێ هەڵەیەکم دەکردو دایکم سەرکۆنەی دەکردم و دەیوت: ئەی عەبیر دەمەوێ ئاوا بکەیت وەکو ئیمان وابە، لەوکاتەدا ئیرەییم پێ ی دەبرد.

منیش زۆر بەهارو هاجی وەڵامم دەدایەوە: دایە ئیمان ئاوسەری من نییە لەمن گەورەترە. لەڕاستی دا لەناو خزمانماندا و نە لەدەستە خوشکانی قوتابخانەمدا کچێکی وەکو ئیمان دانستە نەبوو.

بەداخەوە زۆرینەیان دنیا فریو خواردوی کردبوون، بەزمو فیلمەکان گەورەترین خەمیان بوو دوا مۆدە ڕواڵەتیان بوو، بەلاّم ئیمان بە پێچەوانەوە ئافرەتێکی دەگمەن بوو مۆدەی بەلاوە گرنگ نەبوو، کە لەخانەی دەرخ کردنی قورئان دەگەڕایەوە دەوری ڕۆژانەی دەکردنەوەو یاریدەی پورمی دەدا لەکاری ماڵەوەی دا، کە دەچوە شوێنی نوێژکردنی بە ملکەچی یەوە نوێژی دەکردو دەپاڕایەوە.

ئیمان ژیانی ئاوا ڕۆژانە دەبردە سەرو خشتەکەی ڕۆژانەی ئاوابوو، قەت قسەی ئەوانە کاری تێ نەدەکرد، کە سفوربوونو شوێن ئازادیو ڕۆشنبیری سەردەم کەوتون، بەڵکو بەمتمانەوە لەسەر بڕوای خۆی بوو شانازی پێوە دەکردو بەلۆژێکی ڕاستیو کارزانی دەمەقاڵی لەگەڵدا دەکردنو تا بەسەریاندا زاڵ دەبوو بەسەریاندا سەردەکەوت.

لە یادمە جارێکیان بۆ ئێوارە میوانداری کراین لەلایەن یەکێ لە خزمانمان یەکێ لە ئامادەبوان کە بە گاڵتەو لوتبەرزییەوە لە ئیمانی دەڕوانی وتی: تۆ هێشتا منداڵی بۆ هەندە دینت بە توندی گرتووە؟

ئیمان بە هێمنی وەلاّمی دایەوە: مردن بچوکیو گەورەیی نازانێ، ئەو چارەنوسەی خودا لە هیکڕا هەڵمان دەکوتێتە سەرو کەس نازانێ کەیو بۆ کوێو چۆن؟ کەسێکی تریان بە توێسەوە وتی: بەلاّم زەمەن گۆڕاوەو دەبێ شان بە شانی سەردەم بڕۆیو دوای ئاخر مۆدەی

هاوچەرخ بکەویت، نەك ئەوجلوبەرگە لەبەربکەی کەوەکوژنەکی وەناوکەوتو دەردەکەوی‌وئەنجالەقاقای پێکەنینی دا. ئیمان بە بڕواوەوتی: باشەلەبەرکردنی جلی سفوری کە جوانیەکانی لە شم بەدەرەوە دەخات وام لێ دەکات شارستانی بم؟ ئایا پێویستە دەستەگەمەیەك بم بەدەست ئەوکەسانەوە کە مودەکانی دنیادادەرێژن، کەبەویستی خۆیان جلوبەرگم بکەنەبەرو ڕوتم بکەنەوە؟ ئەوانەی‌والەمن دەکەن بە شوێن کەوتنیان خۆم تێك بدەن، ئایائەمەشارستانی یە؟یان چاولێ کەری خەلکی خراپە؟سێ یەمیان وتی: تۆسنوردەبەزێنی خوابەڕوحمەولێ بوردەیە. ئیمان بە (بێ فیزییەوە) هەڵسایێ‌وەوتی: بەڵێ وایەلەهەمان کاتدا سزاشی توندە. لەوساتەدا ئامادەبوان بەشەرمەوە لەیەکتریان ڕوانی‌وتەریق بونەوە لەوگەمە پێ کردنەیاندا بە ئەو. ڕۆژێکیان پلکم هات مژدەی داواکاری ئیمانی هێناویەشادمانی وتی: سوپاس بۆخوای پیاوەکی بەدین‌و باشی بۆتە دەزگیران کەپێ ی ڕازییە. دایکم بە شادمانی یەوەوتی: خوشکم پیرۆزی بێ‌و پەشیمانی بەدواوە نەبێ‌و خوای لەگەڵدابێ‌و ئیمان شایانی هەموو چاکەێیکە.من بەدەوری خۆم لێم پرسی: پورم کەی زەماوەندی بۆدەکرێت؟وەلامی دایەوە: لەپشوی هاوینی دابەویستی خوا، نەخشەش لەتۆ ئەی عەبیر. بە سەرهاتی

ئیمان لەم سنورەدا نەوەستا، ڕۆژگـار ڕوداوی سـەیری هێنـا، ئـەوەی واقی وڕماندم، دوای مارەبڕینی کچە پلکم نیوەیی مارەیی یـە کـەی دادەمەزرێنێ، نەك هەرئەوەندە، بەڵکوڕازی نابێ ئاهەنگەکی فـراوان بۆزەماوەندەکەی سازبکرێ، تەنیائەوەی هەڵبژارد خزموکـەسو کـاری لەماڵی خۆیاندا میواندارییەکیان بۆ ئامادەبکرێت. ئەوەی ڕاستی بێ ئەم هەڵس‌وکەوتەی پرسیاری زۆری لەدڵدا بۆدروست کردم...ئایاکچی تردەتوانن لەوچاخە سەرمایەدارو پڕلە خۆشگوزەرانی یەدا ئـەم کـارە ژنانیە بکات؟ئیمان ئەوتەقوایەی لە کـوێ بـووە بۆبەرەنگاربونـەوەی هەواوئارەزوەکانی‌وهێزی لەکوێ بـوو جـەنگی پـێ لەگـەڵ شـەیتان‌و وەسوەسـەکانی بکات؟بەرلـەوەی لەگـەڵ شـەیتاندابکەومە جـەنگ دڵنیابووم کەپابەندبوون سەری مرۆڤ بەرزدەکاتەوە، ئەو مرۆڤەی خۆی دەفرۆشێ بۆبە هەشت. ئەوەی لـە دڵمـدابوو نـەما، ئـەوەی شـوێنی گرتـەوە سـوربونم بـوو لەسـەرگرتنی ڕێگـای ئیمـانی کـچە خـاڵم، داواکارم لەخوا ڕێنومام بکـات‌و سـەقام گـیرم بکـات ئـەو بیـسەرو زانیارە.

# چیرۆکی (٤٠)

## کاتێ داوێن پاکی نامێنێت:

بەداخەوە هەندێ لاو کاتێ ویستیان ژن بێنن، زیاترسێرە دەخەنە سەر جوانی... بالآی چۆنە؟ پانی چەندە؟ رەنگی چۆنە؟کێشی چەندە؟ درێژی قژی؟ وبەس! بەلآم قەت لەڕاست ئاینەکەی لێ ی ناپرسن، بەلکو هەندێ گەنج گەرکەسێ پێی بلێ ئەو کچە بەدینە دەلێ نامەوێ زۆر توندە، من کچێکی کراوەم دەوێ نەك داخراو!

ئەمە یان لەم چەشنەیە، ئەم گەنجە پالەوانی ئەم سەربوردەیەمانە، کە سۆراغی کچێکی جوانو شۆخ دەکات، ئەو کەسەیە ئافرەتێکی دینداری هەلنەبژارد دەستی خۆش ببێ، بەلآم ژیان بۆ ئەو کەسەنییە کاتێ بانگ دەکرێ (**فاظفر بذات الدين تبت يداك**) رواه البخاري.

ئەو گەنجە ئەم ئافرەتە جوانەی بەدەست هێنا، کە خوێندکارێکی زانکۆ بوو ئەو بەستە زمانە تەنیا وەکو شوفێرێکی ئەو بوو.

ڕۆتینەکی بە ئەشکەنجە بوو، سبەینان لەخەو هەلدەستاو دەیبردە زانکۆو پاشان دەچووە سەرکاری خۆیو دوای نیوەڕۆش دەچوو هەلی دەگرتو دەیبردەوە مالەوە.

ڕۆژێکیان بردییە زانکۆو خۆشی چووە کارخانەی‌و دوای کات ژمێری کە لە نوسینگەی بوو دەنگی زەنگی تەلەفۆن هات، کە پیاوانی ئاسایش بوونی: تۆ فلانی؟ وتی: بەڵێ: وتیان: فیسار نزیکی تۆیە؟ وتی: بەڵێ؟

پۆلیس وتی: بەیارمەتیت وەرە نەخۆشخانە بە خێرایی.

وتی: بۆچی چی ڕویداوە؟

وتی: ئاسانەو دوامەکەوە.

تەلەفۆنەکەی داناو کلۆڵەکە بەپەلە ڕای کردە نەخۆشخانەو، کەوتە بیرو ئەندێشەی جۆراوجۆرەوە... کە دەبێ چی بەسەر خانمە جوانەکەی هاتبێت؟

گەیشتە نەخۆشخانەو ئۆتۆمبیلەکەی لە جێگایەکی نایاسایی دا ڕاگرت‌و وەکو شێت ڕای دەکردو چووە ژوری فریاکەوتنەوەو پیاوانی ئاسایش لەوێ بوون. وتی: چی ڕویداوە؟ بردیانە ژوری بوژانەوە(الانعاش)، ئەی لەو کارەساتە! دەبینێ ئەو شۆخ‌و شەنگەی دەیبردە زانکۆ شلاڵی خوێنەو کەوتۆتە ژێرباری ئازارو برینی خەستەوەو هەموو لەشی گرتۆتەوە، بەڵام ئازاری ئەو ئابڕو چونە زۆر لەوە تاڵترو گەورەترە.

هاوار دەکات: چی قەوماوە؟ ئەفسەرەکە پێ ی دەڵێ: لەگەڵ دۆستەکەی بووە لە فلان شێوە لەناو ترومبێلدابووە ئەو ڕوداوەی بەسەردا هاتووە. لێرەدا زمانی گیراو دنیا لەبەر چاوی دا ڕەشکەو پێشکەی کردو ڕوی لەژنە درۆزنەکەی کرد: تۆ ناپاکیو زۆر جنێوی بەو ڕووەدا کە ناپاکی پێ کردوە. ئەنجا پێ ی وت: تۆم تەڵاقدا، تۆم تەڵاقدا، تۆم تەڵاقدا، ئەنجا تفی کردە ڕووە بەخوێنەکەی. ئەی خودا ئازارو ئابڕو چونو تەڵاقدانو مردن. دۆستەکەی مردو مێردی تەڵاقی داو ئابڕوی خزمانی شکاندو خۆشی گۆجو ئیفلیج بوو برایە خانەی گۆجو ئیفلیجەکان، تا لەوێ دا ژیان بە کلۆڵیو ئەشکەنجە بەسەربەرێت، کەس نەیبردەوە ماڵەوە. خودا لە تورەییو سزاو تۆڵەی خۆی بمانپارێزێت.

# چیرۆکی (٤١)

## خزمی مێرد لەناوچونە (الحمو الموت)!

پێغەمبەر -دخ- ڕاستی فەرمووە(اياكم والدخول على النساء) فقال رجل من الانصار: افرأيت الحمو؟ قال: الحمو الموت) متفق عليه.

واتە: نەکەن بچنە ژوری ژنان، پیاوێ لە یارمەتی دەران وتی: ئەی ئەگەر خزمە مێرد بێ(وەکو براو مامو خاڵو کوڕەکانیان)؟ فەرموی: خزمی مێرد لەناوچونە.

ئەمە بەسەرهاتێکی واقیعی یە لەشاری(الرياض) دا ڕوودەدات، پیاوەکی ڕاستگۆ بۆی گێڕامەوە، کە خۆی شاهید حاڵی ڕوداوەکە بووەو ئاکامەکەی بەچاوی سەر بینیوە، ڕۆژێکیان لەنەخۆشخانەدا، کە خۆی وەکو ژماریار(المحاسب) کاری تێدا دەکات ژنەكو پیاوێکی بێ سەر دەبینێ پیاوانی ئاسایش تەرمەکانیان بۆ ئەوێ دێنن. ئەمەش درێژەی ئەو بەسەرهاتە دڵتەزێنەیە:

لێرەدا دو ئامۆزا یان دو کوڕە مام دەبن لەتەك یەکترەوەنو هەریەکەیان لە شوققەیەکدا نیشتەجێ بووەو هاتوچۆیان زۆر خۆش دەبێت. ڕۆژێکیان دەڕواتە کەللەی یەکێکیانەوەو وەسوەسەی بۆ دروست دەکاتو ئەویش شوێن خوت خوتۆکە دەکەوێ دەست دەکات

بەدەست تێکەڵاو کردن لەگەڵ ژنی ئامۆزای دا تا دەگاتە ئاستی زینا(خوا بمانپارێزێت).

ئەمەش لەکاتێ دا ڕوی دەدا کە ئامۆزاکەی سەر لەبەیانیان دەچۆ سەرکارو ئەویش ئەو هەلەی دەقۆستەوەو ئەو کارە سێکسی یانە ڕوی دەدا وەکو لەنێوان ژن‌ومێرد ڕودەدات. ماوەیەك ئەم خراپکارییە دەوامی کرد. ڕۆژێکیان ئەو پیاوە زیناکارە پێڵاوەکانی لەدەرەوەی شوقەکەدا لەیاد دەچێت‌و لەو بینایەدا پیاوەکی تر لەسەریانەوە دەژیت، کاتێ دێتە خوارو ئەو پێڵاوانە دەبینێ گومانی بۆ دروست دەبێ، چونکە دەزانێ مێردی ژنەکە لەسەر کارە، ئەی دەبێ ئەو میوانە ناوەختەکێ بێت؟

لەڕۆژی داهاتودا چاودێری دەخاتە سەرو لەنزیکەوە دەڕوانێ‌و گوێ ی لە دەنگەکان دەبێ تابۆی دەرکەوت گومانەکەی لە جێگای خۆیەتی، بینی ئەو پیاوە زیناکارە ئامۆزای کابرایە کە لەکاتی سەرکاردا دەڕواتە لای.

ئەم دراوسێ یە بریاری دا ئەم بەسەر هاتە بۆ خاوەن ماڵەکە بگێڕێتەوە، کە ئامۆزاکەی ناپاکی بەژنەکەی دەکات، ئەوە بوو قسەی خۆی هێنایەجێ، تا بۆ خۆی ڕوداوەکە ببینێت.

کاتێ ئێوارە مێردەکەی گەڕایەوە بەژنەکەی وت: جل‌وبەرگەکانم کۆبکەوە تا چوار ڕۆژ بۆ فلانە شارە بەسەفەر دەڕۆم. لە بەیانی داهاتودا پیاوەکە جانتای سەفەری تاودایە بەو پاساوەی دەڕواتە گەشتێ، جانتاکەی خستە ناو ترۆمبێلەکەیەوەو کەمێ لەماڵ دورکەوتەوەو تا نزیکەی کات ژمێرێ خۆی هێشتەوە.

کاتێ ماڵی بەجێ هێشت ئامۆزاکەی لەکونی شوقەکەیە خۆی لێ گرتبوو، هەر کە دڵنیابوو رۆیشت روی لەژنی ئامۆزاکەی‌و دۆستەکەی کردو کاری خراپی لەگەڵدا کردو هەردوکیان بە ڕوتی لەسەر جێگاکەدا کەوتن‌و دوای ئەوە چوونە خەوێکی قوڵەوە. دوای ئەو کات ژمێرە پیاوەکە گەڕایەوە ماڵەوەو ترۆمبێلەکەی دور لەماڵەوە راگرت، تا ژنەکەی هەست بە هاتنەوەی نەکات، پاشان بە پێیان چووە ماڵەوەو بەهێمنی یەوە لەسەر سەرە قامکەکانی دەڕۆیشت تا کەس لەماڵەوە هەست پێ نەکات.

گەر دەرگای شوقەکەی کردەوەو چووە ژوری نوستن چ ببینێ! دەبینێ ژنەکەی‌و ئامۆزاکەی دوبەدو بە ڕوتی خەویان لێ کەوتووە!

ئەو پیاوەش چووە هەردوکی کوشتن! خوا پەنامان بدات...

## چیرۆکی (٤٢)

## ئاکامێکی تری داوێن پیسی!

بەر لەچەند ساڵێ لەدیمەشق دۆستەکەی خۆی دەباتە شوققەکەی خۆی، هەوا زۆر ساردو سڕ دەبێ، پیاوە مەقاڵەیەك دەست دەداتێ رەژوو خەڵوزی تێدایە دەیهێنتە ژورەوە تا خۆی پێ گەرم بکەنەوە. دوای خۆ گەرم کردنەوەو داوێن پیسی کردن نوستن، ژورەکە بچوك دەبێ، دوای ئەوە بە هۆی نەمانی ئۆکسجین لەژورەکەدا بە هۆی خەڵوزەوە دەخنکێن‌و دەمرن. دوای (٢ ـ ٣) رۆژ دراوسێ یەکانیان بەبۆن دەزانن مردون، ناچار دەرگاکە دەشکێنن‌و کە دەچنە ژورەوە لە دیمەنێکی زۆر قێزەون‌و گوناهدا دەیان بینن. خوا پەنامان بدات.

﴿فَأَتَاهُمُ اللَّهُ مِنْ حَيْثُ لَمْ يَحْتَسِبُوا﴾(١٠ الحشر/٢). بێگومان خودا بە جۆرێ‌و لە جێگایەکەوە سزای ناردنە سەر کەقەت بیریان لێ نەکردبۆوە!

# چیرۆکی (٤٣)

## من دۆستی خۆم دەوێت:

خۆم لە ژوری چاودێری توندا ڕۆژانـە بـەکارەکان هەڵدەستام لـە نەخۆشخانەی(کەنـدی) دا، کـە خوێنـدنی بـاڵای نـوژداریم لـەوێ دا بەسەر دەبرد، سەرنجم دایە (محمد) ناوێ لەسەر قەرەوێڵەی ژمارە(٣) بە، ماوەیەکی زۆر لە ڕوخساری ئەوم ڕوانیو سەیری جـوانی یـەکانی دەموچاوی ئەوم دەکـرد، کـە لـەژێر بۆڕیـەکانی دەزگـای بوژانـەوەدا خەریکە دەمرێت. ئەو لاوەکـی (٢٥) سـاڵانە بـوو توشـی نەخۆشـی نەمانی بەرگری دەست کەوتوو(المناعة المكتسبة-ئایدز)بوبو، بـەهۆی هەوێکی تیژی سی یەکان بەرلـە دو ڕۆژ خرابویـە نـاو نەخۆشـخانەو بارەکەی ترسناك بوو نیمچە نائومێدی یەکی پێوەدیـاربوو، ئەمـەش یەکەم موسڵمان نەبوو لە وڵاتی خۆرئاوادا چارەی بکەم، بەدەست خۆم نەبوو زیاتر ڕوی خۆم دایە ئەم کوڕە.

ئەو دەیتوانی گـوێم لێ بگـرێ، بـەڵام نەیـدەتوانی وەڵام بداتـەوە بەچەند نوزەیەك نەبێ، کـە حـاڵی بـوونی نـەدەکرا، پەیوەنـدیم بـە ماڵەوەیان کرد، دایکی وەڵامی دایەوە کە زمانەکـەیان لـە عـەرەبی لوبنانی دەچووو، باوکی بازرگانەکی قەبەبوو لـە شـارەکەداو دوکـانی

شیرنەمەنی هەبوون، لە تەلەفۆنەکەدا حاڵەتی کورەکەیم پێ ڕاگەیانـد زەنگی مـەترسی هەر پتر بەرز دەبۆوە لەو دەزگایەی بەکورەوە گەیەنرا بوو، کە ئاماژەی دابـەزینی تونـدی سـوری خـوێنی دەکـرد، لەگـەڵ قـسەکردندا لەگـەڵ دایکـی دا شـڵەژامو پـێم وت: پێویـستە ئێـستا ئامادەبی وتی: مـن سـەرقاڵم دوای کـار دێـم، وتم: ئـاخر درەنگـەو تەلەفۆنم داخستەوە.

دوای نیو کاتـژمێر نەخۆشـەوانەکە داوای کـرد کـە ئامـادەبم بـۆ چاوکەوتن بە دایکـی نەخۆشـەکە کـە تەمـەنی مـام ناوەنـد، هـیچ سـیمایەکی ئیـسلامەتی پێـوە دیارنـەبوو، شـڵەژابوو، بـارودۆخی مەترسی داری کورەکەیم پێ گەیاند، ئەویش لـە قـورپی گریـانی دا. ویستم هێوری بکەمو پێم وت: داوای چاك بونەوەی بۆ لـەخودا بکـە. بەسەر سورمانەوە سەیری کردم ووتی: چی؟ وتم بۆی لـەخوا بپـاڕێوە! وتی: تۆ موسڵمانی؟ وتم(سوپاس بۆ خودا). وتی: ئێمەش موسڵمانین. وتم(ماشـاء الله) ئەی بۆچی ناچی هەندێ قورئان لەتەك سەری بخوێنی شایەد خوا باری سوك بکات؟ لەو کاتەدا زۆر بە جۆش گریـاو وتـی: نازانم، وتم: چۆن نوێژ دەکەی؟ وتی: هەر لەوکاتەوە پێمان ناوەتە ئـەم ولاتەیە تەنیا جەژنان نوێژ دەکـەین، بـەلام دەچـمە سـەردانی گـۆری

باب‌و باپیرانم لە لوبناندا لەهەردو ساڵی داو نزایـان بـۆ دەکـەم، بـێ ئەوەی مێردم پێ بزانێ، من ژنەکی ئاین پەروەرم.

لـە دڵـی خۆمـدا وتم:(خوایـە دیـن پـەروەر نوێـژ ناکـاو قورئـان نازانێت)! لەڕاست حاڵی کوڕەکەیم پرسـی؟ وتـی کـوڕەکی دڵ پاکـەو ژیانی خۆش دەوێ، بەڵام ساڵی ڕابردو لەگـەڵ ئـەو کـچەیەدا خۆشـی ویستبوو توشی هەندێ لادان بوو، حاڵی بـاش بـوو. وتم ئایـا نوێـژی دەکرد؟ وتی: نەء، بەڵام لە نیەتی دابوو لە ساتەکانی پـیری دا حـەج بکات. (لەدڵی خۆمدا وتم: کێ گرنتی ئـەوەت دەداتـێ سـی‌و چـل‌و پەنجاو شەست ساڵ بژی، زۆر کەس بەرلـە بیـست سـاڵەیی مـردون).

دوایی لەو کـوڕە هـەژارە نزیـك کـەوتم کەلـە گیانـەلادابوو دەزگـای ورياكردنەوە دەنگی زیاتر بەرز دەبـۆوەو دایکیـشی بـەکوڵ دەگریـاو نەخۆشـەوانەکان بەسـەیرەوە دەیـانڕوانی، زۆر هـەوڵم دا،(شـەهادە) تەڵقینی ئەم گەنجە بکەم، بەڵام ئەوبێ وەڵام بوو. چەند جـارێ هـەوڵم دا، گەنجەکە تا ڕاددەیێ هاتەوەسـەرخۆو پـێم وت: بڵـێ: (لا الـه الا الله)، لاوەکە بەهەموو ئەندامەکانیەوە هەوڵی ئـەوەی داو فرمێـسك بە چاوی دادەهاتنە خوارەوە، بینیم ڕەش دا دەگـەڕا، پاشـان کەوتـە قسەکردن‌و وتـی: دەرمانـەکی هێورکـەرەوە(المسکن)م دەوێ ئـازارم بشکێنێ. وتم: ئەی لاو بڵێ: (لا اله الا الله) لێوەکانی دەجـولان وتم:

خوایە ئێستا قسە بکات. بە ئینگلیزی وتی(I cant I cant) من دۆستەکەم دەویێ ناتوانم. ترپەکان کەم دەبونەوەو هەر (هاورێکەم دەویێ ناتوانم) دوبارەی دەکردەوەو ترپەکانی دڵی دادەبەزیو هەناسەکانی کەم دەبونەوە. خۆم بۆ نەگیراو لەپڕمەی گریانم داو وتم: تکایە ئەی لاو شەهادە بێنە، ئەو دەیگوت: ناتوانم. ترپەکان لە لێدان کەوتن و من بەسەرسوڕمانی تەواوەو دەستی لاوەکەم گرتبوو دایکیشی کەوتبوو بەسەر سنگی لاوەکەداو هاواری دەکردو دەموچاوی لاوەکە ڕەش داگەڕا بوو، بەدەست خۆم نەبوو هەموو نەریتەکی پزیشکیم لەیاد کردو لە هەستیاری هەڵوێستەکە تاسامو بەڕوی دایکی دا هاوارم کرد: تۆ بەرپرسیاری، تۆو باوکی ئەو ڕاسپاردەیەو لەدەست دا، خوا لە کۆڵتان بکاتەوە. دایك بەتاسانەوە دەگریا. لەو کاتەدا ئەم ئایەتەم هاتەوە یاد﴿أَمْ حَسِبَ الَّذِينَ اجْتَرَحُوا السَّيِّئَاتِ أَن نَّجْعَلَهُمْ كَالَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ سَوَاءً مَّحْيَاهُم وَمَمَاتُهُمْ سَاءَ مَا يَحْكُمُونَ﴾ الجاثية/٢١[٥].

---

([5]) ئەم (٤٣) بەسەر هاتەمان لە(ضحايا الحب/ يوسف الحاج) وەرگرتووە. (٧) چیرۆکەکەی ترمان لەدموع تائبە/ یوسف الحاج) وەرگرتووە، مەبەست لەم حەوت بەسەرهاتە ئەوەیە کە دەرگای تۆبەی خوا کراوەیە بۆ ئەو کەسانەی لەکاتی دەرفەتدا تۆبە دەکەن، پەلە دەکەن تا کات بەسەر نەچووە!

## چیرۆکی (٤٤)

## ئایا بۆ دایکی خۆت پێ خۆشە؟

(ئەحمەد) لە (مسند)ەکەی داگێڕایەوە: گەنجێ هاتە خزمەت پێغەمبەرو -دخ- ووتی: ڕوخسەتم بدەیە زینابکەم، دانیشتوان ڕویان تێ کردو سەرکۆنەیان کرد وتیان: بێ دەنگ بە.

پێغەمبەر -دخ- فەرموی: نزیك بکەوە، ئەویش نزیك بۆوەو هاتە بەر دەمیەوە دانیشت. پێغەمبەر -دخ- فەرموی: بۆ دایکی خۆت پێت خۆشە؟ وتی: لەبەر ئەوەی لەگەڵ پێغەمبەردا (ﷺ)دا قسە ئەکات ئەبێ بڵێ: "خوابمکا بەقوربانیت" نەء. فەرموی(ﷺ): خەڵکیش بۆ دایکانی خۆیان حەزناکەن. پاشان فەرموی(ﷺ): بۆ کچی خۆت پێ خۆشە؟ وتی: نەء بەقوربانت بم ئەی پێغەمبەری خوا. فەرموی(ﷺ) خەڵکیش بۆ کچانی خۆیان حەزناکەن . پاشان فەرموی(ﷺ): بۆ خوشکی خۆت حەزدەکەیت؟ وتی نەبە خوا گیانم فیدات بێ. فەرموی: خەڵکیش بۆ خوشکی خۆیان حەز ناکەن. فەرموی(د.خ): بۆ خوشکی باوکت (پلك-پور)ت پێ خۆشە؟ وتی: نەء خوام بەقوربانت بکات. فەرموی(ﷺ): خەڵکیش بۆ پلکی خۆیان حەز ناکەن. فەرموی(ﷺ): بۆ خوشکی دایکت(پلك) پێت خۆشە؟

وتی: نەبەخوا بەقوربانت بم. فەرموی(ﷺ): خەڵکیش بۆ پلکی خۆیان حەزناکەن.

ئەنجا پێغەمبەر-د.خ- دەستی لەسەر داناو فەرموی:(خوایە لێ ی خۆش بەو دڵی پاکژیکەوەو داوێن پاکی بکە). دوای ئەوە لاوەکە قەت ئاوەڕی لە هیچ شتێ نەداوە لە زیناو(زینای لەبەر چاو کەوت).

## چیرۆکی (٤٥)

## (فوضه یل بن عیياض)

ئەم پیاوە ئەویندارى کەنیزەیەك دەبیٚ و بەڵێنی دەداتیٚ شەو بە دیداری بگات. کاتیٚ سەر دیوار کەوت گویٚ ی لە کەسیٚ بو قورئانی دەخوێندو دەیوت:﴿ أَلَمْ يَأْنِ لِلَّذِينَ آمَنُوا أَن تَخْشَعَ قُلُوبُهُمْ لِذِكْرِ اللَّهِ﴾(الحديد:١٦)؟ واتە: ئایا کاتی ئەوە نەهاتووە بۆ ئەوانەی بڕوایان هێناوە دڵیان لە خوابترسیٚ؟ ئەنجا بەرەو دوا گەڕایەوە وتی: بەڵیٚ بەخوا ئێستا کاتی هاتووە. بەشەو چووە کەلاوەیەك هەندیٚ خەڵکی کاروانچی لیٚ بوو هەندیٚ دەیانوت فوزەیڵ ڕێگری دەکات. هەندیٚ وتیان باردەکەین و هەندیٚ وتیان: تا بەیانی دەوەستین فوزەیڵ دێتە سەر ڕێگامان و چەتەیی لە ئێمە دەکات. وتی: لەم کاتەدا بیرم کردەوە وتم: من شەوانە گوناهـ دەکەم و هەندیٚ لە موسڵمانان زندەقیان چووە، بەخوا خوا بۆیە منی ناردۆتە ناو ئەوان تا بترسم. خوایە من تۆبەم کردووەو تۆبەشم هاوسێیتی کەعبەی پیرۆز بێت.

## چیرۆکی (٤٦)

## تۆبەی (کیفل)

(احمد)لە (مسند)داو(الترمذي) لە(سنن)ەکەیدا لە پێغەمبەری(ﷺ) گێڕاوەتەوە(کیفل) پیاوێکی بەنو ئیسرائیلی بوو، قەت لە گوناهو تاوان نەدەگەڕایەوە، ژنەکی هاتە لا(٦٠)دیناری دایە تا زینای لەگەڵدا بکات، کاتێ لەگەڵی دا جوت بوو وەکو جوت بوونی ژنومێرد ژنەکە لەرزیو گریا. کیفل وتی: تۆ ئاوا دەکەیو قەت کاری ئاوات نەکردوە، دەبڕۆ بۆ خۆت بێ. ئەنجا وتی: مەرج بێ قەت من لەم ڕۆبەدواوە گوناه نەکەم، ئەو شەوە گیانی سپاردو لەسەر دەرگای نوسرابوو خودا لە کیفل خۆش بووە.

## چیرۆکی (٤٧)

## تۆبەی ڕاهیبێکی بەنوئیسرائیلی:

بەیهەقی لە (ابن مسعود) گێڕاویەوە: (خواناسێك(٦٠) ساڵ لە پەرستگاکەی خۆیدا خوای پەرست، ئەنجا ژنێ هات هاتە تەنیشتی یەوەو شەش شەوان خراپەی لەگەڵدا کرد، پاشان لە دەستی ڕاکردو پەنای بردە بەر مزگەوتێو سێ ڕۆژ مایەوە هیچی نەخوارد، پاشان نانە ئەستوکەکی هێنا کەرتی کرد، پارچەکی دایە کابرایەکی لای ڕاستیو پارچەکەی تری دایە کەسێکی لای چەپ، لەو کاتە خوا لە ڕێگای فریشتەی مردن گیانی کێشا، هەر شەستەکە خرایە تای ترازوەکەو شەش شەوەکەش خرایە تای ترازوەکەی ترەوە ئەو گرانتر بوو، پاشان ئەستوکەکە دانرا لەهەر شەشەکە گرانتر بوو.

# چیرۆکی (٤٨)

## تۆبەی بەشیری حافی:

بەشیر لەماڵەکەی خۆیدا لەگەڵ هاورێکانی سەرخۆش دەبێو بەزمو ئاهەنگو یاری خۆیان دەکەنو سدرگەرمی ئەوە دەبن، پیاو چاکێ(بەناوی پێشەوا موسای کاظم-ر- کە لە پشتی پێغەمبەرە-د.خ-(وەرگێر) بەلایاندا ڕەت دەبێو لەدەرگاکە دەدات، یەکێ لەکەنێزەکان دەڕواتە لایو پێ ی دەفەرمێ: خاوەنی ئەم ماڵە ئازادە یان بەندەیە؟ وتی: ئازادە. فەرموی: ڕاست دەکەی گەر بەندە بایە ئەدەبی خواپەرستی بەکاردەهێناو وازی لە ڕەقسو سەما دەهێنا؟ بەشیر گوێ ی لە ئاخاوتنیان دەبێ بە پێ ی پەتیو سەری ڕوت دەڕواتە دەرو پیاو چاکەکە دەڕواتو بەکەنیزەکە دەڵێ: هاوار بۆ تۆ کێ قسەی لەگەڵدا کردی؟ ئەو هەواڵەکەی بۆ گێڕایەوە. وتی: بەکوێدا ڕەت بوو؟ وتی: لێرەوە. بەشیر شوێنی کەوت تا دۆزییەوە، وتی: گەورەم تۆ بووی لەبەر دەرگاکە وەستایتو قسەت لەگەڵ کەنێزەکە داکرد؟ فەرموی بەڵێ. وتی: چیت فەرموو؟ ئەویش فەرمایشتەکەی بۆ دوبارەکردەوە. بەشیر ڕوی خۆی لە خۆڵ وەرداو وتی: بەڵێ من بەندەم، پاشان هەر بە سەری ڕوتو پێ ی خاوس مایەوە تا ناونرا(حافی) واتە: پێ پەتی.

# چیرۆکی (٤٩)

## (الربيع بن خيثم)و تۆبەی ئافرەتێك:

(ابن قدامة) لە (التــوابين) دا گێڕاویەوە: کۆمەڵە کەسانێ ژنەکیان ڕاسپارد کە زۆر جوان دەبێ خۆی پیشانی (رەبیع بن خەیثم) بدات کە خوانــاس‌و زانایــەکی نــاودار دەبــێ شــایەد لەخــشتەی ببــات، گــەر سەربکەوێ هــەزار درهــەمی دەســت خۆشــی دەبێــت. ئــەم ئافرەتــە جوانترین پۆشاکی دەکاتە بەرو خۆشترین بۆن لــەخۆی دەدات، پاشــان کاتێ لە مزگەوت دێتــەدەر دەڕواتــە پێــشی یــەوە. ئــەویش ســەیری کردو، ئەم کارەی زۆر لا گەورەبوو، ڕوی تێ کرد کــە ڕوی کراوەبــوو، ئەنجا ڕەبیع پێ ی وت: باشە گەر خودا توشی ســێ بــەڕۆوتان بکــات ڕەنگ‌و جوانیت بگۆڕی چی دەکــەیت؟ یــان ئەگــەر فریــشتەی مــردن دابەزێتە سەرت‌و ڕەگی ملت ببڕێ چی دەکەیت؟ یــان ئەگــەر نــەکیرو مونکیر لێیان پرسیت چی دەکەیت؟ لــەو کاتــەدا ژنــە هــاوارەکی لێ بــەرزبۆوەو کــەوت بورایــەوە، بــەخودا گــەر هاتــەوە هــۆش ئەوەنــدە لەخواپەرستی دا قوڵبۆوە گــەر مــرد وەکــو لقــەدارەکی ســوتاوی لێ هاتبوو.

# چیرۆکی (٥٠)

## تۆبەی گەنجێك و كچێك:

(جاء عن عمرالنخعي)گێڕاویــەوە وەكولــە(التــوابين ابــن قدامــة) داهاتووە: لەكوفەدا كوڕەكی زۆرجوان‌وخوا پەرســت هەبوویــەكیَ بــوو لەزاهیدو سۆفیەكان، بووە میوانی كەسانێكی نەفعی، چاوی بەكــچیَ كەوت لەویَ دازۆرجوان بوو مەست‌وحەیرانی كردو، ئەویش بەهــەمان شێوە. بۆیە چودا خوازی كرد. بــاوكی وتــی: بۆئامۆزاكــەی نــاوی لیَ هێنراوە. سەودای ئەوین‌و عیشق لە كەللەی دان‌و توشی دەردە سەری هاتن‌و ئازاری ئارەزولیَ ی دان، ئەو كچە هەواڵی بۆنارد: زانیومە تــۆ زۆرت من خۆش دەویَ، بــۆمنیش گرفتــاری پەیــدابووەو تــۆم خــۆش دەویَ. گەرئەتەویَ سەردانت دەكەم. یان من رێگات بۆ خۆش دەكــەم سەردانم بكەیت. گەنجە بەو كچەی وت: هیچ كامیان ناكەم

(قُلْ إِنِّيَ أَخَافُ إِنْ عَصَيْتُ رَبِّي عَذَابَ يَوْمٍ عَظِيمٍ) الانعام/١٥.

لــە ئــاگریَ دەترســم قــەت خــامۆش نــابیَ‌و ناكوژێتــەوە. ئــەنجا هەواڵەكە بەو كچەیە گەیشتەوە. كەوتی: من دەبینم لەگەڵ ئەوەشــدا ئەو زاهیدەو لە خوا دەترسێت؟ بەخوا بۆ ئەم ئەركە كەس لــە ئــەویتر لە پێشترنییە، ئەو خوای هەموو بەندەكانە. پاشان كــچەكە لــەدنیادا

براو پشتی تێ کردو بەرگی خوری کردە بەرو، بەڕاستی خودای پەرست، لەگەڵ ئەوەشدا لە ئەوینی لاوەکەدا دەکولاو ئاخی بۆ هەڵدەکێشا تا لە سۆزی ئەودا لاواز بوو تواوەو مرد. ئەم لاوە نێوان نێوان سەردانی گۆڕی دەکرد. شەوێکیان لە خەوی دا بینی، کە وەکو مانگی چواردە بوو لە جوانی دا، وتی: ها چۆنیو دوای من چیت لێ هات. کچەکە وتی:

نعم المحبة يا حبيبي حبكما

حب يقود الى خير واحسان

وتی: چیت بەسەر هاتووە؟ وتی:

الى نعيم وعيش لازوال له

في جنة الخلد ملك ليس بالفاني.

پێی وت: لەوێ لەیادم مەکە منیش لەدنیا لە یادت ناکەم. وتی: بەخوا قەت لە یادت ناکەم، لە خوای گەورەی خۆمانمان داواکرد کە بە هەوڵو ماندوبوون یارمەتی ئەوەی دام. پاشان ڕۆیشت. پێ ی وت: کەی ئەتبینمەوە؟ وتی: زۆر نابات دەگەیە لامان. دوای ئەو خەونە کوڕەکە لە هەفتەیەك پتر نەژیا. (خوا ڕوحم بە هەموو لایەك بکاتو لە ئێمەو هەموو لایەك خۆش بێت).

## ( دوا وتەمان )

ئـەوەی خوێندمانـەوە بەسـەرهاتی کۆمەڵـە کەسـانێ بـوو کـە بـە ئارەزوەکی سێکسی زۆر ڕەفتەنیو شـەهوەتەکی بـەهێزو وشـەی گـورگی چاوبرسی مرۆیی بەدرۆو بەسەیرکردنی لادەرانە، یان موبایلەکی فریودەر، یان لە ڕێگای ئەنتەرنێتو برادەری خراپەو توشی تراژیدو کلـۆڵیو ئـازار هاتووەو بۆتە قوربانی خۆشەویستی. ئەوانە بە خامـەی خـوێنی خۆیـانو ڕوباری فرمێسکەکانیان بەسەرهاتەکانی خۆیان نوسیونەوە تا بـەو وشـانە کەسانی وەکو خۆیان ڕزگاربکەنو ئـەوانیش نـەبن بـە نێـچیری بەدەسـت خراپەکارانەوە، کە دەیانەوێ ناموسی خەڵکی بشکێننو شـەڕەفی کـچان ببەنو ژیانی لاوییان لێ بکەن بە دۆزەخ، لەمێردو خێزانو منـداڵو خـزم دایانببڕنو، دوا جار توشی سزای دنیاییو قیامەتی خواییی بن!

هیوادارم ئەم بەسەرهاتە وەکـو چـیرۆکەکەی بـەر ئـاگردان نـەبن بـۆ زاخاوی مێشكو کات بەسەربردن بخوێنرێنەوە، بەڵکو ڕێگایەکی ڕوناك بن بۆ کوڕانو کچانو برایـانو خوشـکانو دایکـانو باوکـان، کـە دەیانـەوێ ڕێگای ڕاست بگرنو لە هەردوو دنیا سەرفیرازو بەختەوەربن!

(وصلی الله علی سیدنا محمد وعلی آلـه الطـاهرین وازواجـه واصـحابه الی یوم الدین).

چیوەی سەرو

٢٠٠٨/١٠/٢٠

## ناوەرۆك


| لاپەڕە | بابەت |
| --- | --- |
| ٤ | (پێشەكی) |
| ٨ | چیرۆكی (١) كچێكی (١٢) ساڵانە هاوار دەكات بە شوو بدەن |
| ٩ | چیرۆكی (٢) باوكە بڵێ ئامین ! |
| ١٠ | چیرۆكی (٣) ئافرەتان لە وڵاتی ئێوەدا شاژنن |
| ١٣ | چیرۆكی (٤)باوكە تۆ لەئارت بردوم و ئێستاش هاتوویت دەگریت |
| ١٥ | چیرۆكی (٥) كاسێتی ڤیدیۆ ژیانی منی لەناوبرد |
| ٢٠ | چیرۆكی (٦) یاداشتەكانی پیرەژنێ لەگەڵ خۆشەویستی ناپاكی دا |
| ٢٤ | چیرۆكی (٧) شەیتان چوارەم كەسمان بوو |
| ٢٧ | چیرۆكی (٨)كۆڵێتی خەمان (كوخ الاحزان). |
| ٣٤ | چیرۆكی (٩)ئەو جوانەی ژیانی منی وێرانكرد : |
| ٤١ | چیرۆكی (١٠) قوربانیەكەو قازی |
| ٤٥ | چیرۆكی (١١) سەتەلایت (الدش) ژیانی منی وێران كرد |
| ٥٠ | چیرۆكی (١٢) عادلی كوڕم : |
| ٥٢ | چیرۆكی (١٣) خالیدی كوڕم : |
| ٥٣ | چیرۆكی (١٤)سوعادی كچم : |
| ٥٤ | چیرۆكی (١٥) ئەمەلی كچم : |
| ٥٥ | چیرۆكی (١٦) سەتەلایتی شوم (الدش المشؤم) |
| ٦١ | چیرۆكی(١٧) بەسەرهاتێ لە یەكێ لە ساڵۆنەكاندا ... |
| ٦٤ | چیرۆكی (١٨) چیرۆكی دووەم هەر لە ساڵۆنێكدا |
| ٦٥ | چیرۆكی (١٩) خانمێك ماوە ماوە سەردانی ساڵۆنەكانی دەكرد |
| ٦٦ | چیرۆكی (٢٠) لەگەڵ شارەزایەكی ئارایشتدا |
| ٦٨ | چیرۆكی (٢١) بەسەرهاتێكی تراژیدی ئەنتەرنێت(سەرەرۆیی هەرزەكارێك) : |
| ٧٢ | چیرۆكی (٢٢) ژوانێ لە شالی یەدا : |
| ٧٦ | چیرۆكی (٢٣) مامۆستایەكی ئافرەت و قوتابی یەكی كچ |
| ٨٢ | چیرۆكی (٢٤) هیوایەكی لەدەست چوو: |
| ٨٥ | چیرۆكی (٢٥) سەربەسەر (واحدە بواحدە) |
| ٨٨ | چیرۆكی (٢٦)بێچووی مراوی مەلەوانە |

| | |
|---|---|
| چیرۆکی (٢٧)بەر لەوەی تەوراس[٦] بە سەری بکەوێت | ٩٠ |
| چیرۆکی (٢٨)کوا غیرەت و پیاوەتی! | ٩٣ |
| چیرۆکی (٢٩) تەنیا لەبەر ئەوەی ژنەکەی لەبەر چاوی پیاو بپارێزێت | ٩٥ |
| چیرۆکی (٣٠) خۆت لەمۆبایل بپارێزە | ٩٦ |
| چیرۆکی(٣١) ژیانی ئابڕوچوون و رابواردن: | ٩٩ |
| چیرۆکی(٣٢) ئافرەتێکی سەرگەردان | ١٠١ |
| چیرۆکی(٣٣) من پەشیمانم | ١٠٤ |
| چیرۆکی(٣٤)کرداری منداڵ لەباربردنم هەڵبژاردووە یان خۆکوشتن | ١٠٧ |
| چیرۆکی (٣٥)کەنیشکەی مەسینجەر | ١٠٩ |
| چیرۆکی(٣٦) وتووێژێکی نێوان باوک و کچێ لەخەوندا | ١١١ |
| چیرۆکی (٣٧)ئەزۆك دەبێت: | ١١٤ |
| چیرۆکی(٣٨) شاهید بن من کچی خۆم لێ مارەبڕیوە | ١١٥ |
| چیرۆکی(٣٩) بەسەرهاتی (ئیمان) | ١١٨ |
| چیرۆکی (٤٠)کاتێ داوێن پاکی نامێنێت: | ١٢٢ |
| چیرۆکی(٤١) خزمی مێرد لەناوچونە (الحمو الموت)! | ١٢٥ |
| چیرۆکی (٤٢) ئاکامێکی تری داوێن پیسی | ١٢٨ |
| چیرۆکی(٤٣) من دۆستی خۆم دەوێت: | ١٢٩ |
| چیرۆکی(٤٤) ئایا بۆ دایکی خۆت پێ خۆشە؟ | ١٣٣ |
| چیرۆکی(٤٥)(فوضه یل بن عییاض) | ١٣٥ |
| چیرۆکی(٤٦) تۆبەی(کیفل) | ١٣٦ |
| چیرۆکی(٤٧) تۆبەی راهیبێکی بەنو ئیسرائیلی | ١٣٧ |
| چیرۆکی(٤٨) تۆبەی بەشیری حافی | ١٣٨ |
| چیرۆکی (٤٩) (الربیع بن خیثم)و تۆبەی ئافرەتێك | ١٣٩ |
| چیرۆکی(٥٠) تۆبەی گەنجێك و کچێك | ١٤٠ |
| دوا واتەمان | ١٤٢ |


(٦) (الفأس): تەوراس، تەوداس، بیور.